


# ٥٠ چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵەکەت بخوێنەرەوە



ئامادەکردن و وەرگێڕانی

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٧

پرۆژەی خوێندنەوە بۆ هەمووان
زنجیرە کتێبەکانی بڕیار «١٩٠»




# ٥٠

# چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵەکەت بخوێنەرەوە

ئامادەکردن و وەرگێڕانی

بەرزان ئەبوبەکر

چاپی یەکەم

٢٠١٧ زاینی

ناوی کتێب: ٥٠ چیرۆکی پەروەردەیی بۆ منداڵەکەت بخوێنەرەوە

ئامادەکردنی: بەرزان ئەبوبەکر

دیزاین: گۆڤاری بڕیار

نۆبەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٧ز - ١٤٣٨ك

تیــراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانە: پیرەمێرد

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی «١٢٧٦»ی ساڵی «٢٠١٧»ی پێدراوە.

# بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

## پێشەکی

دایکانو باوکانی بەڕێز.. مامۆستایانو پەروەشیارانی خۆشەویست.. خەمخۆرانی پەروەردەو دڵسۆزانی منداڵەچاوگەشەکان، ئەم پەرتووکەی بەردەستت لە ٥٠ چیرۆکی پەروەردەیی زۆر بەسوود پێکهاتووە بۆ منداڵەچاوگەشەکان.

- چیرۆکەکانی ئەم پەرتووکە تۆوی ڕەوشتە جوانەکانو بەها بەرزەکان لە ناخی منداڵدا دەچێنن.

- کەسایەتیو ژیریو ڕۆحی منداڵەکەت بەهێز دەکەن، بیرو خەیاڵو هزری فراوان دەکەن.

- زانستو زانیارییان زیاد دەکەن، پەرتووکو خوێندنەوەیان لەلا خۆشەویست دەکەن.. توانای قسەکردنیان بەهێزتر دەکات، دەبنە شارەزای ئێستاو ڕابردوو..

دەکرێت تۆی پەروەرشیار بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکەت، سوودی لێببینیت، شەوانەو بەر لە نووستن بە یەکێك لە چیرۆکەکانی ئەم پەرتووکە، دڵی منداڵەکانت خۆش بکەیتو بەهای بەرزو مانای جوانی ژیانیان لە ناخدا بڕوێنیت، چونکە چیرۆکەکان هەم چێژبەخشن، هەم باشترین ڕێگەن بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانتان، وەك دەزانن منداڵان هەمیشە حەزبە گوێگرتن لە چیرۆك دەکەن، تۆش دەتوانیت لەو ڕێگەیەوە منداڵەکەت ئاسودەو خۆشحاڵ بکەیتو هاوکات پەروەردەیەکی دروستی بکەیت.. دڵنیابن ساتێکی خۆش لەگەڵ ئەم چیرۆکانەدا بەسەردەبەن، لە هەمووی گرنگتر خۆتانو منداڵو خێزانە بەڕێزەکانتان، لە دەوری ئاگردانی خۆشەویستی کۆدەکاتەوە. هیوادارم توانیبێتمان سودێکمان گەیاندبێت بە ئێوەی ئازیز.

بەرزان ئەبوبەکر

٢٠١٧-٣-١١

# ناوەرۆك

لە دێر زەماندا شازادەیەك ویستی هاوسەرگیری بكات، بۆ ئەم مەبەستە پرسو ڕاویژی بە چەندین حەكیمو خاوەن ئەزموون كرد، بۆئەوەی هاوكاری بكەن لە هەڵبژاردنی هاوسەری ژیانیدا.. دواجار باشترین بۆچوونی هەڵبژارد كە ئامۆژگاریان كرد لەگەڵ ڕاستگۆترین كچی شاردا هاوسەرگیری بكات، چونكە كەسی ڕاستگۆ هەرگیز ناپاكیت لەگەڵ ناكات، دزی لە سەروەتو سامانت ناكات، هیچ كات درۆت لەگەڵ ناكات، هەموو شتێكت ڕاشكاوانە بۆ باس دەكات.. بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا ئاهەنگێك بۆ كچانی شارەكەی ساز بكاتو ڕاستگۆترینیان بكاتە هاوسەری ئایندەی، كاتو ساتی ئاهەنگەكە بە تەواوی شاردا ڕاگەیەنرا، ڕۆژو كاتو وادەی ئاهەنگەكە هاتە پێش، كچانی شار هەموو بەپەلەو پەرۆشەوە بەرەو مەیدانو گۆڕەپانی ئاهەنگەكە دەستە دەستە كەوتنە ڕێ،لەو نێوەندەدا كچی خزمەتكارێكی هەژار، زۆر حەزی دەكرد بەشداری ئاهەنگەكە بكاتو ببێتە هاوسەری ئایندەی شازادەو ببێتە خانمی یەكەمی وڵات، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا بڕوات بەشداری بكات لەو ئاهەنگەدا، بەڵام دایكی دەترسا لەوەی بڕواتو بەشداری بكاتو دڵی بشكێتو كاریگەری خراپی لەسەر دروست بكات، چونكە بێگومان شازادە لەگەڵ كچانی خاوەن پلەوپایە هاوسەرگیری دەكات، لەبەرئەوە ویستی ڕێگری بكات لە كچەكەیو ڕێگەی نەدات بەشداری ئاهەنگەكە بكات.. بەڵام كچەكەی كەسێكی ژیرو بە ئەزموون بوو، وتی: دایەگیان نیگەران مەبە، خۆ ئەگەر من بەشداری بكەم، هیچ

زیانێك ناكەم، تەنها بەشـــداری ئاهەنگەكـــە دەكەم، دواجار كێ دەڵێت من لە تاقیكردنەوەكەی شـــازادەدا ســـەركەوتن بەدەست ناهێنم، بەوجۆرە قەناعەتی بەدایكـــی كردو ئەویش وەك كچانی شـــار بەرەو ئاهەنگەكە بەڕێكەوت.. لە ڕێگەدا كۆمەڵێك كچی لـــە خۆبایی بینی، هەمووان بە دیتنی كچـــی خزمەتكار كەوتنە توانج لێدانو گاڵتـــە پێكردنی، یەك دەیگوت: تۆ بۆ خۆت ماندوو دەكەیـــت؟ یەكەی دەیگوت: تۆ بڵێی شـــازادە لەنـــاو ئەم هەموو كچـــە خانەدانو جوانو باڵا بـــەرزەدا، كچی خزمەتكارێك بكاتە هاوســـەری خۆی.. ئیدی هەر یەكەو بە جۆرێك توانجی لێ دەدا، بەڵام هیچ كام لەو قســـانە كچی خزمەتكاریان ســـارد نەكردەوە، بەڵكو بەوپەڕی متمانەبەخۆبوونـــەوە وەڵامی دانەوەو وتی: بە بەشـــداری كردنم نە زیانم پێ دەگات، نە زیان بە ئێوەی خانەدان دەگەیەنم، خاتوونەكان..

كاتێك هەمووان گەیشـــتنە شـــوێنی ئاهەنگەكە، شازادە دوای بەخێرهاتـــنو ڕوونكردنەوەی مەبەســـتی ئاهەنگەكە، فەرمانی كرد كە هەر یەك لە بەشداربووان لە كاتی چوونەدەرەوەدا تۆوی گوڵ وەربگرێت، شازادە وتی: دەمەوێت ئەو تۆوانە بڕوێنن، دوای شـــەش مانگی تر بگەڕێنەوە بۆ هەمان شـــوێن، تـــا بزانم كام لە ئێوە توانیویەتی جوانترین گوڵ پەروەردە بكات، بێگومان خاوەنی جوانترین گوڵ هەڵدەبژێردرێتو دەبێتە خانمی یەكەمی وڵات!

هەر یەك لە بەشـــداربووان تۆوەكانیـــان وەرگرتو گەڕانەوە ماڵو دەســـتیان كرد بە ڕواندنی تۆوەكان، كچە خزمەتكارەكەش

که یەکێك بوو لە بەشداربووان، تۆوەکەی وەرگرتو گەڕایەوە ماڵ، زۆر هەوڵی دا، بەلام هەرچی دەکردو دەکۆشا، تۆوەکە نەدەڕوا، هەرچەندە گڵەکەی بۆ دەگۆڕی، ئینجانەکەی بۆ دەگۆڕی، شوێنەکەی بۆ دەگۆڕی، هیچ سوودی نەبوو، تۆوەکان سەوز نەدەبوون، ڕۆژان هاتو چوو، کات تەواو بوو، شەش مانگ تەواو بوو، بەلام تۆوەکان چۆن وەریگرتبوون، هەر بەو شێوەیە بوون، لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری دا بگەڕێتەوە، بۆ ئاهەنگەکەو لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بێتو لەبری چەپکە گوڵ، تۆوەکان وەکو خۆی بباتەوە، هەرچەندە دایکی هەوڵی دا ڕێگەی نەدات بگەڕێتەوە ئاهەنگەکە، بەلام کچەکە توانی قەناعەت بە دایکی بکاتو وتی: دایەگیان خۆ من هیچ زیانێك ناکەم تەنها بەشداری دەکەمو ئامادەی ڕێوڕەسمەکە دەبم.. لە ڕێگەدا دووبارە چاوی کەوت بە دەستەکچانی شار، کە هەر یەکەیان گوڵێکی زۆر جوانی بە دەستەوە بوو، دووبارە گاڵتەیان بە کچی خزمەتکار کردەوەو بە توانجەوە پێیان دەگوت: سلاو لەو گوڵە جوانەی بە دەستی خاتوونەوەیە، زۆر جوانە، ئەوە چۆنو لە کام خاكو ئاو گەورەت کردووە؟! بەلام کچە لە بەشداریکردن پەشیمان نەبووەوە!

هەموان گەیشتنە مەیدانی ئاهەنگەکە، شازادە سەیری یەك یەك لە گوڵەکانی دەکردو دەستخۆشی لێ دەکردن، کاتێك گەیشتە لای کچی خزمەتکار بە سەرسامییەوە پرسی: ئەوە کوا گوڵەکەی تۆ، بۆچی تۆوەکانت وەك خۆی هێناوەتەوە؟

کچی خزمەکار لە وەلامی شازادەدا وتی: قوربان زۆر هەوڵم دا

بەڵام تۆوەکان نەڕوان! دەزانن چی ڕووی دا؟

شازادە وتی: پیرۆزت بێت من لەگەڵ تۆ هاوسەرگیری دەکەم!

ئەم قسەیە تەواوی کچانی ئامادەبووی ئاهەنگەکەی سەرسام کرد، هەمووان وتیان ئێمە جوانترین گوڵمان هێناوەتەوە، شازادە کەسێك هەڵدەبژێرێت کە تەنانەت گوڵەکەی چەکەرەشی نەکردووە!

شـــازادە لە وەڵامیاندا وتی: تەواوی ئەو تۆوانەی دران بە ئێوە تۆوی نـــەزۆك بوون‌و نەدەڕوان، ئێوە ڕاســـتگۆ نەبوون لەگەڵ مندا، هەمووتان تۆوەکانتان گۆڕیوە، تەنها ئەم کچە ڕاستگۆ بووە، منیش دەمەوێت شاژنێکی ڕاستگۆ هەڵبژێرم. ئیدی شازادە لەگەڵ کچی خزمەتکار هاوسەرگیری کردو بووە خانمی یەکەمی وڵات!

پوختە:

✍ ڕزگاربـــوون، ســـەرفرازی، بەختـــەوەری، ســـەرکەوتن، لـــە ڕاستگۆییدایە، لەبەرئەوە هەمیشە ڕاستگۆ بن‌و هیچ کات درۆ مەکەن.

✍ ئەوەی کە کچی خزمەتکارەکەی گەیاندە کۆشـــکی پادشاو بووە خانمی یەکەمی وڵات، ڕاســـتگۆیی بوو، کەواتە ڕاســـتگۆبە دەگەیت بە ئاواتەکانت.

✍ بڕوابەخۆبـــوون‌و ورەبەرزی، خاڵێکی گەورەیە کە دەبێت هەرگیـــز لە یـــادی نەکەین، چەنـــد کەس ویســـتیان ئەم کچە پەشـــیمان بکەنەوەو توانجیـــان تێگرت، تا پەشـــیمان بێتەوەو نەهێڵن بەشداری ئاهەنگەکە بکات، بەڵام کەس لەوان نەیانتوانی پەشیمانی بکەنەوە. چونکە متمانەی بە خۆی هەبوو!

لە دێر زەماندا شارێك هەبوو، یاسایەكی یەكجار سەیرو نامۆیان هەبوو، بەپێی نەریتو یاسای شارەكە هەر هاولاتییەكی شارەكە تەمەنی بگەیشتایەتە شەســـت ساڵ، لە شار دوور دەخرایەوەو رێگە نەدەدرا لە ناوشارداو لە ماڵەكەی خۆیداو لەگەڵ نەوەكانی خۆیدا بمێنێتەوە.

خەڵكـــی زۆر نیگـــەران بـــوون بـــەو نەریتو یاســـایەو بە دووركەوتنەوەی دایكو باوكیان یەكجار پەرێشـــان بوون، بەلاَم پادشای شار كەسێكی ستەمكارو دڵڕەق بوو، كەس لە دانیشتووانی شار نەیدەتوانی سەرپێچی فەرمانەكەی بكات..

ڕۆژێـــك لاوێكی خەڵكـــی ئەو شـــارە كە نـــاوی فەرید بوو، سەرچاوەو بژێوی ژیانی لە ڕێگەی كیشاوەرزییەوە دەستدەكەوت، ئەو جوتیارێكی لێهاتوو بوو، فەرید زۆر بەدڵخۆشی لەگەڵ دایكی ژیانـــی دەگوزەراند، ڕۆژێكیان فەرید بـــە دایكی گوت: دایە گیان هەفتەی ئایندە بەرهەمی كشـــتوكاڵەكەمان پێـــدەگات، دەتوانین بیفرۆشـــینو كەمێك باروگوزەرانی ژیانمانـــی پێ خۆش بكەینو كەلوپەلی پێویست بكڕین.

دایكی وتی: كوڕی شیرینم، بەلاَم من ناتوانم چیدی لەگەڵ تۆدا ژیان بگوزەرێنم.

كوڕەكەی بەسەرسامییەوە گوتی: بۆچی دایەگیان؟!

دایکی گوتی: من بەساڵاچووم‌و هەفتەی ئایندە تەمەنم دەگاتە (٦٠) ســاڵ، دەبێت بە دەســتی خــۆت لێرەو لەم شــارە دوورم بخەیتەوە..

فەرید گوتی: نەخێر دایەگیان من هەرگیز شتی واناکەم..

دایکی وتــی: تۆ ناچاری ئــەو کارە بکەیت، خۆئەگــەر ئەو کارە نەکەیت، پادشا بە خراپترین شێوە تۆڵەت لێدەسەنێت‌و سزات دەدات..

ڕۆژەکان تێپەڕیــن، کاتێك فەرید زانــی ڕێگە چارەیەك نییە، دەســتی دایکی گرت‌و لە شار دووری خســتەوە، کاتێك لە شار دوورکەوتنــەوەو کاتی ئەوە هات کە فەرید بۆ دواجار ماڵئاوایی لە دایکی بکات‌و بە تەنها جێی بهێڵێت، هەرچەندی کرد نەیتوانی لە دایکی دووربکەوێتەوە، لەبەرئەوە بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە بــە دایکی گــوت: دایەگیان من هەرگیز ناتوانــم تۆ جێبهێڵم، لە درەنگانی شــەودا پێکەوە دەگەڕێینەوە بــۆ ماڵەوە، هەوڵدەدەین کەس ئێمە نەبینێت، تۆش لە ماڵ مەیەرە دەرەوە نەبادا هەواڵەکە بگاتەوە بە پادشا.. هەرچۆنێك بێت ئەمە باشترە وەك لەوەی تۆ لێرەدا تەنها جێبهێڵم.

دایك‌و کوڕ بە نهێنی گەڕانەوە بۆ ماڵەوەو نەیانهێشــت کەس ئاگاداری پلانەکەیان بێت..

کات بە خێرایی گوزەری دەکرد، ڕۆژێکیان پادشــا ســەرجەم

جوتیارانی شـــاری بانگهێشت کرد بۆ کۆشـــك، پێی گوتن: چەند شتێکم لە ئێوە دەوێت، هەر کەس نەتوانێت ئەنجامی بدات ئەوە بەشێك لە داهاتەکەی لێدەسەنین.. پادشاش کەسێکی بێ بەزەییو دڵڕەق بوو، نەیدەزانی ســۆزو بەزەیی چییە.. لەبەرئەوە کەس نەیدەتوانی لە فەرمانی دەربچێت.

داوای کرد هەر یەك لەوان گوریسێکی لە خۆڵەمێش بۆ بهۆننەوە، پەیامەکەی پێڕاگەیاندنو وتی: ئێســـتا هەر کەس بڕواتەوە سەر کارەکەی خۆیو هەوڵی دروستکردنی گوریسەکە بدات، جوتیارەکان گەڕانەوە ماڵەکانیان، ئەگەرچی هەمووان دەیانزانی جێبەجێکردنی ئەو داوایە ئەستەمە، بەڵام چارەیەکی دیکەیان نەبوو!

فەریدیـــش گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کاتێـــك دایکی کوڕەکەی بینی خەم لە ڕووخساری دەبارێت، پرسی: شتێك بووە؟

فەرید داواکاری پادشای بۆ گێڕایەوە.. دایکی گوتی: ئاسانە من چارەســـەری گونجاوم لایە، تۆ بڕۆ گوریسێك بهێنە، بیئاڵێنە لە بەردێکی لوســـەوە، پاشان گەرمی بکە، تا گوریسەکە دەسوتێت، ئەو کات گوریســـەکە بە بەردەکەوە دەبێت بە خۆڵەمێش، تۆش بەو شێوەیە گوریسەکە ببە بۆ جەنابی پاشا..

فەرید فەرمانەکـــەی دایکی جێبەجێکردو گوریســـەکەی بە بەردەکەوە برد بۆ جەنابی پادشـــا، پادشا بەبینینی زۆر سەرسام

بوو، پرسی: چۆن توانیت ئەو کارە سەختە ئەنجام بدەیت؟

فەریدیش ڕاستگۆیانە گوتی: جەنابی پادشا ئەوە حیکمەتو لێهاتوویی‌و دانایی دایکم بوو، هاوکاری کردم بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکەی تۆ. ئەو کات پادشا زانی کە ئەو بڕیارە نامۆیەی شارەکەی بە دەرکردنی ئەو مرۆڤانەی تەمەنیان دەگاتە شەست ساڵ، بڕیارێکی ناڵۆژیکی‌و هەڵەیە. هەر لەو ساتەدا بڕیاریدا کە بە هەموو خەڵکی شار ڕابگەیەنن، کە کۆتایی بەو بڕیارە هاتووە، لێرە بە دواوە مرۆڤە بە ئەزموونەکان لە خۆمان دوورناخەینەوە، ئەوان گەنجینەیەکی بە نرخن، پێویستە ڕێزیان لێبگرین‌و سوودیان لێ ببینین، نەك دووریان بخەینەوەو ئازاریان بدەین.

پوختە:

✍بەسالاچووان کەسانی بە ئەزموون‌و شارەزان، پێویستە هەمووان ڕێزیان لێبگرین‌و سوودیان لێببینین، هەروەها منداڵی ژێر لە ژێر هیچ پاساوێکدا دایك‌و باوکی جێناهێڵێت.



# وەفاداریی پاشای دارستان

لــــه دێر زەماندا، گیانــــداران پێکەوە لە دارســــتانێکدا دەژیان، تەبایـــیو هاوڕێیەتی لە نێوانیاندا لە لوتکەدا بوو، جگە لە ڕێوی، کـــەس لەوان فێڵو تەڵەکەی نەدەزانـــی، ئەوان یەکدییان خۆش دەویســـت، پێکەوە بەئاسوودەیی هاوشـــێوەی خێزانێك دەژیان..

لـــەم چیرۆکەدا، باس لە بەرخێکی بچکۆلانە دەکەین، کە لەگەڵ بەرخێکی دیکـــەدا، زۆر هاوڕێیەتییان خۆش بوو، ئەگەر ڕۆژێك یەکدییان نەدیبـــا، زۆر بۆ یەکدی بێتاقـــەت دەبوون، ڕۆژێکیان هاوڕێی بەرخە بچکۆلانەکە، زۆر نەخۆش بوو، بەرخە بچکۆلەکە بۆ چوونە لای هاوڕێکەی، داوای مۆڵەتی لەدایکی کرد، دایکی وتی: ئێســـتا ئێوارەیەو خۆر خەریکە تیشکە زێڕینەکەی ئاوا دەبێت، تاریکایی شـــەو باڵ بەسەر ئاسماندا دەکێشێت.. چاوەڕێ بکە، تا سبەی خۆر، بە تیشـــکە زێڕینەکەی، ئاسمان ڕووناك دەکاتەوە، ئەو کات پێکەوە دەڕۆین بۆ لای هاوڕێکەتو سەردانی دەکەینو لە تەندرووســـتیی دڵنیا دەبین. بەڵام بەرخـــە بچکۆلە گوێی بۆ ئامۆژگارییەکەی دایکی نەگرت، بێ پرسی دایکی ڕۆیشتە دەرەوەو بەرەوماڵـــی هاوڕێکەی بـــەڕێ کەوت، کاتێك خـــۆی بینییەوە، لەنێوەڕاستی دارستان لەنێو کۆمەڵێك درەختی زەبەلاحو چڕوپڕ، هیـــچ ماڵێکی بەدی نەکرد، دنیا خەریك بوو تاریك دەبوو، بەرخە بچوکەکە زۆر ترسا، هەر دەگەڕا لێرەو لەوێ، بەڵام هیچی بەدی نەکرد، دەستی کرد بە گریان، لەو کاتەدا مام ڕێوی چاوی کەوت

به بەرخە بچکۆلانە.. وتی: بچکۆلە ئەوە چییە؟ بۆچی دەگریت؟

بەرخـــە بچکۆلە وتی: لـــە نێو ئەم دارســـتانەدا، ڕێگەم ون کردووەو نـــە دەزانم بگەڕێمەوە ماڵی خۆمـــان، نە دەتوانم ماڵی هاوڕێکەم بدۆزمەوە، تکایە هاوکاریم بکە..

مام ڕێوی وەکو پیشـــەی هەمیشـــەیی خۆی، بیـــری لە فێڵێك کردەوە، بڕیاری دا بەرخە بچکۆلە بکات بە دیاری دەستی بۆ شێری پاشای دارستان، وتی: بچکۆلانە وەرە لەگەڵ من، تا بتگەیەنمەوە نێو ماڵی خۆتان. بێگومان ئێستا دایکت چاوەڕێتەو دڵی لە لاتەو خەمبارە بە نەگەڕانەوەت!

مام ڕێوی بەرخە بچکۆلەی گەیاندە ناو ماڵی شێرو وتی: جەنابی پاشا، هیوادارم ئەم دیارییە بچکۆلانەیەم لێ قەبووڵ بکەیت!

بەڵام ئەوەی ڕێوی سەرســـام کـــرد، ئەوەبوو کە دیتی بەرخە بچکۆلانە زۆر خۆشحاڵ بوو، پێی گوت: ئەوە ناترسی؟

بەرخە بچکۆلە لەبری ئەوەی وەڵامی مام ڕێوی بداتەوە، ڕووی لە شای دارستان کردو وتی: من دەناسیتەوە، بەرخە بچکۆلانەم، باوکم حەکیمی دارستان بوو، باوکم بوو هاوکاری کردیت، ئەو کاتەی ڕاوچییەکان ویســـتیان تۆ ڕاو بکـــەن، برینەکەی تیمار کردیت، تا ئەو کاتەی چاك بوویتەوە، ئایا ئەو ڕووداوەت لەیادە؟

شـــێری پاشـــاو بەوەفا: بەڵێ بیرمە، باوکت پیاوێکی بەخشندەو حەکیم بوو، پزیشکێکی لێهاتوو بوو، هەرگیز

ئەو هاوکارییەی باوکت لەیاد ناکەم!

بەرخە بچکۆلانە وتی: پاشا، چۆن یارمەتیم دەدەیت، من ڕێگەم ون کردووەو دەمەوێت یارمەتیم بدەیت؟

شێری پاشا وتی: بێگومان من دەتگەیەنمەوە ماڵی خۆتانو بە خانەوادەکەت شادت دەکەمەوە!

مام ڕێوی گوتی: بەڵام جەنابی پاشا.. پاشا ڕێگەی نەدا قسەکەی تەواو بکات، وتی: من ناتوانم وەڵامی چاکە بە فێڵو تەڵەکەو ناپاکی بدەمەوە.. شێری پاشا لە بێشەکەی هاتە دەرەوەو لەگەڵ بەرخە بچکۆلەکەدا، بەڕێ کەوت بەرەو ماڵی بەرخە بچکۆلانە!

کاتێك گەیشتنەوە ماڵەوە، دایکی پێی وت: ڕۆڵەکەم، بۆچی گوێت بۆ ئامۆژگارییەکەم نەگرت؟

بەرخە بچکۆلەکە وتی: بمبوورە دایەگیان، جارێکی دیکە، هەڵەی وا دووبارە ناکەمەوەو لە ئامۆژگارییەکانی تۆ دەرناچم!

دایکی وتی: ئەگەر چاکەو پیاوەتی باوکت نەبووایە، ئێستا تۆ لەنێو گەدەی شێری پاشادا بوویت!

پوختە:

✍ منداڵەچاوگەشەکان، لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە فەرامۆشکردنی ئامۆژگاریی دایەو بابە، دوچاری ڕووداوی ترسناكو ناخۆشمان دەکات، هیوادارم هەرگیز ئامۆژگارییەکانی دایكو باوکتان فەرامۆش نەکەن، هەمیشەفەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن!



هەرگیز بۆ سەروو خۆت مەڕوانە!

هێمن «لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بوو، ڕۆژێکیان بەسەرسوڕمانەوە بۆ ئاسۆی هاوڕێی ڕوانی، کە لە تەنیشتی خۆی دادەنیشت، بە پێنووسێکی نوێو جوانو سەرنجڕاکێش وانەکانی دەنووسییەوە، پاشان سەیرێکی پێنووسەکەی دەستی خۆی کردو ئاهێکی هەڵکێشاو سەرێکی ڕاوەشاندو بەحەسرەتەوە لەبەرخۆیەوە گوتی: هەموو ڕۆژێك ئاسۆ بە جلوبەرگێکی نوێو پێنووسێکی نوێوە دەردەکەوێت، خۆزگە منیش وەکو ئەو دەوڵەمەند بوومایەو بمتوانیایە هەر ڕۆژەی بە پێنووسێکی نوێ بنووسم.. پاشان گوتی: خودایە بۆچی من لە خێزانێکی هەژارو نەدارو کەمدەرامەت لەدایك بووم؟؟!! بۆچی ژیانو گوزەرانی زۆرینەی هاوڕێکانم ژیانێکی لێوان لێوە لە سەروەتو سامان! بەڵام من مندالّی ماڵێکی هەژارمو بێبەشم لەو هەموو خۆشیو ڕەفاهیەتو خۆشگوزەرانییە»!!

چەندە حەزم دەکرد جلوبەرگی منیش وەکو جلوبەرگی ئەوانو پێنووسی منیش هاوشێوەی پێنووسەکانی ئەوان بێتو هەروەکو هاوڕێکانم پاسکیلو یاریو پلەیستەیشنو تۆپی باشم هەبووایە!

لەناکاو خەیاڵاتەکانی پچڕاو هاتەوە نێو پۆل، بیری لە قسەو ئامۆژگاریی مامۆستاکەی کردەوە کە هەمیشە دەیگوت: (ڕۆڵەکانم، هەرگیز مەڕوانن بۆ سەروو خۆتان، بەڵکو بڕوانن بۆ ئەوانەی

له خوار ئێوەن‌و باروگوزەرانیان له ئێوه خراپتره)!

هێمن کاتێك ئەم ئامۆژگارییەی بەبیر هاتەوە، به خۆی گوت: بەســه بۆ من که فێرخوازێکی ســەرکەوتووم، ڕاســته من له ڕووی ئابوورییەوە، له ماڵێکی هەژاردا ژیان دەگوزەرێنم، بەڵام له ماڵێکدام که لێوانلێوه له سۆزو میهرەبانی، که بنەمای ماڵەکەمان لەســەر خۆشەویستی‌و ڕێزگرتن‌و ئاسوودەیی بنیاتنراوە! پاشان زەردەخەنەیەکــی کردو بەئاگا هاتەوە، ترســا لەوەی کەســێك چاوی لێبووبێت که خەیاڵی ڕۆیشتووە، دوای تەواوبوونی دەوام، هێمن بەخێرایی بەرەو ماڵ ڕۆیشتەوە، بەڵام جیاواز له ڕۆژان، ئەمڕۆ نیگەران‌و خەمبار بوو، کاتێك گەیشته ماڵەوە، جانتاکەی فڕێ داو سەری خسته سەر ئەژنۆکانی‌و دەستی کرد به گریان!

دایکی زۆر هەوڵی دا هێوری بکاتەوە، لێی پرسی کوڕی شیرینم، چی ڕووی داوه بۆچی دەگریت؟

هێمن گوتی: هیچ شتێك نەبووە، تەنها کەمێك سەرم ئازاری هەیە!

دایکی ڕۆیشــت، چایەکی گەرمی بۆ هێنا، بەڵام ئەسرینەکانی هێمن وەکو دڵۆپەباران هۆنهۆن دەهاتنه خوارەوە، پاشــان هێور بووەوەو کەمێك بیری کردەوەو دووباره له خۆی پرســی: بۆچی ئەم کارەم کرد، له کاتێکدا خودا فەرمانی کردووە، که دەستپاك‌و ئەمیندار بین‌و یەکدیمان خۆشبوێت! دواتر بەهێواشی جانتاکەی

کردەوەو سەیرێکی کرد، پێنووسە سوورە لەعنەتییەکەیە!

هەوڵی دا بیگرێت بە دەستییەوە، بەڵام هەستی دەکرد پارچەیەك ئاگری بە دەستەوەیە! جانتاکەی داخستەوەو چەندجارێك سەری ڕاوەشاندەوە!

بە خۆی دەگوت: باشە ئەگەر سبەی ئاسۆ پرسی: ئایا تۆ پێنووسە تازەکەی منت نەبینیوە، چی پێبڵێم؟ بەدەم ئەو قسانەوە چاوەکانی چووە خەوو بەتەواوی خەوی لێکەوت!

بۆ سبەی کاتێك بە ئاسۆ گەیشت لە قوتابخانە، نەك هەر پرسیاری پێنووسەکەی لێ نەکرد، بەڵکو بە ڕوویەکی خۆشەوە، پێشوازی لێکردو بانگهێشتی کرد بۆ خوانی ئێوارە! پاشان هێمن سەیرێکی ئاسۆی کردو لەبەرخۆیەوە گوتی: ئەگەر دەزانیت ئەو کەسەی بانگهێشتی دەکەیت، دوێنی چی لەگەڵدا کردوویت؟

خۆ ئەگەر بتزانیایە چ تاوانێکی بەرامبەر کردوویت، هەرگیز بانگهێشتت نەدەکرد؛ چونکە هێمنی هاوڕێت دزە، جەردەیە! دزی لێکردوویت!

دوای تەواوبوونی دەوام، هێمن گەڕایەوەماڵەوە، بەڵام ئەمڕۆ حاڵی کەمێك باشتر بوو لە دوێنێ، داوای مۆڵەتی لە دایكو باوکی کرد؛ تا ڕێگەی بدەن؛ بۆ ئێوارە بڕوات بۆ دەعوتەکەی ماڵی ئاسۆی هاوڕێی!

دایكو باوکی ڕێگرییان لێ نەکرد، بەپێچەوانەوە بڕێك

پارەشـــیان پێ دا؛ بۆئەوەی دیارییەکی خنجیلانە بۆ ئاسۆی هاوڕێی بکڕێت، هێمن بەم هەڵوێســـتەی دایكو باوکی، زۆر دڵخۆشـــبوو، پاشـــان دیارییەکی بۆ ئاسۆ کڕی، دواتر پێنووسەکەی بە دەستەوە گرتو نووسی هاوڕێی ئەزیزم ئاسۆ: هیوادارم خۆتو خانەوادەت هەموو ساڵێك پێکەوە بە خۆشی ژیان بگوزەرێنن.. هیوای ژیانێکی ئاســـوودەو لێوانلێو لە ســـەرکەوتنو بەختەوەریت بۆ دەخوازم، هاوڕێکەم دەزانم کاتێك ئەم دیارییە ســـادەیە هەڵدەپچڕی سەرت ســـوڕدەمێنێت؛ چونکە لەگەڵ دیارییەکەمدا، پێنووسێکی سوری جوان دەبینیت، لە ڕاستیدا نازانم چی بڵێم؛ چونکە لە شەرمەزاریدا دەتوێمەوە! تکات لێدەکەم بمبوورە لەو هەڵەیەی کردم!

بۆ ڕۆژی دواتر هێمنو ئاسۆ سەرقاڵی شیکاری ڕاهێنان بوون، هەر یەکێکیان بە پێنووسێکی سوری تازەو جوان! زەردەخەنە لە چاوەکانیان دەباری!

پوختە:

✍ مرۆڤ شـــایەنی هەڵەکردنە، بەڵام مرۆڤی ژیر هەر زوو لە هەڵەکەی پەشـــیمان دەبێتەوەو دان بە ڕاستییەکاندا دەنێتو هەرگیـــز هەڵەکان دووبـــارە ناکاتەوە! هیـــوادارم تۆش هەرگیز هەڵەکان دووبارە نەکەیتەوەو دان بەڕاستییەکاندا بنێیت!

جارێکیان حوشترێکی شەل بیستی کە حوشترەکانی ناوچەکە بە نیازن پێشبڕکێیەك ئەنجام بدەن، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا بەشداری پێشبڕکێکە بکات، سەرەڕای ئەوەش کە قاچێکی تەواو نییەو شەلە.

بۆ ڕۆژی دواتر داوایەکی پێشکەشی لیژنەی ناونووسین کرد تا ناوی تۆمار بکەن لە لیستی پێشبڕکێکاراندا، لیژنەی ناونووسین داوای ئەم حوشترە شەلەیان زۆر لا سەیرو نامۆ بوو!

حوشترەکەش پێی وتن: بۆچی سەرتان سوڕماوەو داواکەم بە نامۆ دەزانن؟ من خێرام لە ڕۆیشتن‌و جەستەشم بەهێزو پتەوە!

لیژنەکە ترسان لەوەی کە دووچاری زیانێك ببێت لە کاتی پێشبڕکێکەدا، بەڵام لەسەر داواو بەرپرسیاری خۆی ناویان تۆمارکرد.

ڕۆژی پێشبڕکێ هاتە پێش، حوشترەکان هەموو لە گۆڕەپانی پێشبڕکێ ئامادەبوون، کاتێك ئەم حوشترە شەلەیان بینی کە دەیەوێت بەشداری بکات لە پێشبڕکێکەدا، هەمووان گاڵتەیان پێکرد..

حوشترە شەلەکەش لە وەڵامیاندا وتی: لە کۆتایی پێشبڕکێکەدا دەبینین کە کێ بەهێزو خێرایەو دەتوانێت پێشبڕکێکە بباتەوە!

پێشبڕکێ دەستی پێکرد، حوشترەکان وەکو تیر دەرچوون،

حوشترە شـەلەکەش لە دوای هەموویانەوە بوو!

بەڵام ورەی دانەبەزی‌و زۆر بە ئارامی‌و لەســـەرخۆیی ڕێگەی دەبڕی، چونکە ئەگەر خێرا بڕۆیشـــتایە قاچەکانی تووشی ئازار دەهاتن..

حوشترەکانی دیکەش بە چیاکەدا هەڵگەڕان، چیاکە زۆر بەرز بوو، ڕێگایەکی هەورازو دوورو‌ودرێژ بوو..

حوشـــترە لاوەکان هەوڵیانـــدا بە خێرایی بە ســـەر چیاکەدا هەڵگەڕێن، بەڵام زۆر ماندووبوون.

هەندێکیان لە ئەنجامی ئەو ماندوێتییەیان کەوتنە خوارەوە، هەندێکی تریان نەیانتوانی چیدی بەردەوام بن لەسەر ڕۆیشتن، هەربۆیە بڕیاری گەڕانەوەیان داو پاشەکشـــەیان لە پێشبڕکێکە کرد.

حوشترە شـەلەکەش بە هێواشـــی‌و بێ خۆ ماندووکردن‌و بە متمانە بە خۆبوونەوە بەردەوام ڕێگەی دەبڕی!

زۆربەی حوشـــترەکان پێش ئـــەوەی بگەنـــە لوتکەی چیاکە پاشەکشـــەیان کرد، ئەو حوشترانەی کە توانیان بگەنە لوتکەی چیاکە ژمارەیان زۆر کەم بوو، ئەوانیش زۆر ماندووبوون، لەسەر لوتکەی چیا کەوتنە سەر گازی پشت، تا کەمێك پشوو بدەن..

حوشتره شەلەکەش کە بەوپەڕی بڕوا بە خۆبوونو ئارامییەوە ڕێگەی دەبڕی، تا گەیشـــتە لوتکەی چیاکە. چونکە لەسەرخۆو بەردەوام ڕۆیشـــتبوو هەستی بە ماندوویەتییەکی ئەوتۆ نەکرد، هەربۆیە بێ پشوودان بەرەو خوار بوویەوەو گەڕایەوە بۆ شوێنی دیاریکراو..

ئەو حوشـــترانەش کە لە پشوودابوون ئاگایان لە گەڕانەوەی حوشترە شەلەکە نەبوو تا گەیشتە خوارەوەی چیاکە..

ئیدی زۆر هەوڵیاندا تا پێی بگەنەوە، بەڵام نەیانتوانی...

بوو بە یەکەم حوشتر کە گەیشتە کۆتایی پێشبڕکێکە...

کاسەی پاڵەوانێتییەکەی بردەوەو زۆر شانازی بە خۆیەوە دەکرد...

پوختە:

✍ منداڵانی ئازیز، هۆکاری ســـەرکەوتنی حوشـــترە شەلەکە سێ خاڵی سەرەکی بوو، کە وای لە حوشترەکە کرد پێشبڕکێکە بباتەوەو سەرکەوتن بە دەست بهێنێت:

✍ بڕوا بە خۆبوون.

✍ بەردەوام بوون.

✍ پەلە نەکردنو ئارامگرتن.

# کەس مرۆڤی دووزمانی خۆشناوێت



ڕۆژێکیان داپیرە وەك هەمیشە لە ژوورەکەی خۆی دانیشتبوو، نەوەکانی لێی کۆبوونەوەو داوایان لێکرد کە چیرۆکێکی خۆشیان بۆ بگێڕێتەوە، داپیرەش زەردەخەنەیەکی کردو وتی: لە دێر زەمانـدا کوڕێك هەبوو ناوی نەژاد بوو، نەژاد لە نێو هاوڕێکانیدا بە کەسێکی دووزمانو سیخوڕ ناوبانگی دەرکردبوو، هەموان ڕقیان لە نەژاد بوو، کەس خۆشی نەدەویست، بەردەوام خۆیان دوورەپەرێز دەگرت لە نەژادو هاونشینیو هاوڕێیەتیان نەدەکرد..

نـــەژاد لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیـــدا زۆر خراپ مامەڵەی دەکـــرد، هەر کات باوکی لـــە کار دەگەڕایەوە، بـــە هەڵەداوان دەڕۆیشت بۆ لای‌و دەیگوت: بابە فلان ڕۆنەکەی ڕشت، خوشکە گەورەکەم گوڵەکەی شـــکاندەوە، بـــرا بچووکەکەم پەردەکەی دڕانـــد.. لە قوتابخانـــەش نەژاد هەواڵی تـــەواوی هاوڕێکانی بۆ مامۆســـتاکای باس دەکرد، هەر مامۆســـتایەك دەهاتە ژوور، نەژاد هەڵدەستاو دەیگوت: فلان قوتابی ئەرکی ماڵەوەی نەنوسیوەتەوە، فلان کەس خوشـــکەکەی بابەتەکەی بۆ نووســـیوەتەوە، فیسارە قوتابی زۆر هاروهاجە، ئەوەشـــیان کتێبەکەی دڕاندووە، ئەوی دیکەیان دەرگاکە بە قایمی داخستووە... هتد.

نەژاد لەسەر ئەم نەریتە خراپەی بەردەوام بوو، دەزانن چی ڕوویدا ڕۆڵەکانم؟ لە کۆتاییدا ڕاجح بە تەنها مایەوە، خۆشەویستی مامۆستاو هاوڕێکانی لە دەســـت دا، خۆشەویســـتی‌و ڕێزی خوشك‌و براکانی لە دەستچوو، هیچ کام لە دراوسێ‌و کوڕانی گەڕەك خۆشیان نەدەویست..

ئایا کەستان بینیوە کەسی دووزمان‌و سیخوڕی خۆشبووێت؟ کەســـتان بینیوە ڕێز لە کەســـێك بگرێت کە هەمـــوو نهێنی‌و هەواڵێکی هاوڕێکانی بۆ مامۆستاکانی بگێڕێتەوە؟

ڕۆژێکیان لە وانەی زانســـت دا، نەژاد زۆر خەمبارو بێتاقەت بوو، مامۆســـتای زانست لێی پرســـی: نەژاد بۆچی وا بێتاقەت‌و خەمباریی، شتێك ڕووی داوە؟

نەژاد لە وەڵامدا وتی: مامۆستاگیان، یەك هاوڕێم نەماوە، یەك کەس منی خۆشناوێت، هیچ کەس ئامادە نییە یاریم لەگەڵدا بکات، تەنانەت کەس لەگەڵیشـــمدا دانانیشێت.. هەمووان لە من دوور دەکەونەوە، بە خێسەوە سەیرم دەکەنو گاڵتەم پێدەکەن.

مامۆستای زانست وتی: نەژاد من چەندجار ئاگادارم کردیتەوە، کە واز لـــەم نەریتە خراپە بهێنیت، چەندجـــارم وت: ئەوەندە سکاڵا مەکەن ئەوەندە قسە مەگێڕەوە، بەڵام تۆ هەر سوربوویت لەســـەر ئەم نەریتە خراپەت، تا دواجار ئەوەت دوورییەوە کە چاندوتە، تاڵاوی ڕەفتارە خراپەکانت دەنۆشیت.

مامۆســـتا وتی: نەژاد دەتوانیت لە ئێستاوە سەرەتایەکی تازە بۆ خۆت دروست بکەیتو واز لە نەریتە خراپەکان بهێنیتو دەست بکەیت بە هەڵسو کەوتی جوانو ڕەفتاری شیرین، بە دڵێکی پاكو جوانەوە دەست پێ بکە، دڵنیام دوای ماوەیەك دەتوانیت خۆشەویستی هەموو هاوڕێو کەسو کارەکەت بەدەست بهێنیتەوە.

پوختە:

✍ کەسانی دووزمانو سیخوڕ، هیچ کەس خۆشی ناوێن.

✍ دواجـــار ئەو کەســـانە خەڵکی لێیـــان دووردەکەونەوەو بەرهەمی ئەوەی چاندوویانە دەیدوورنەوە.

✍ لە کۆتاییدا مرۆڤ دەتوانێت خووە خراپەکانی بگۆڕێت بە نەریتو خووی باشو بەسوودو متمانە بۆ خۆی دروست بکاتەوە.



# یەکگرتن هێزە!



مێروولەیەکی بچکۆلانە لەگەڵ خێزانەکەیدا بە بەختەوەری ژیانـــی دەگوزەراند، ڕۆژان هاتو چـــوو، مێروولەبچکۆلەکە بە بیری دا هات کە ئیدی گەورە بووەو پێویستە بڕوات بۆ دارستانو لە شوێنێکی ئارام بە تەنها ژیان بگوزەرێنێت، چونکە قەرەباڵغیو ژاوەژاوی ئەندامانی خێزانەکەی ئەویان بێزار کردبوو.

لەبەرئـــەوە حەزی دەکرد دوور لـــە ژاوەژاوو قەرەباڵغی، بە تەنهاو لە شـــوێنێکی ئارام ژیان بگوزەرێنێت، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا لە ماڵ بڕواتە دەرو بەرەو دارستان ڕێگە بگرێتە بەرو بە دوای ماڵێکی ئارامدا بگەڕێت، ئەو پێی وابوو ئەگەر بە تەنها ژیان بگوزەرێنێت زۆر باشـــترو ئاسوودەترە، وەك لەوەی لە نێو قەرەباڵغی ئەندامانی خێزانەکەیدا بێت.

شـــەوێکیان کاتێك بینی دایکیو خوشكو براکانی نووستوون، بە ئەســـپایی هەڵساو ماڵەکەی جێهێشـــت، لە کاتێکدا نەریتی مێروولەکان وەها بوو کە بۆ هەر کوێ بڕۆیشـــتنایە پێکەوە بە کۆمەڵ دەڕۆیشتن!

لەبەر خۆیەوە دەیگوت: ئەگەر من بە تەنیا لە ماڵ دەربچمو بە تەنیا بژیم، ئەوا باشتر چێژ لە ژیان دەبینمو ئاسوودەتر ژیان دەگوزەرێنم، دواجار لە ماڵ چووە دەر، بەلای ڕاستو چەپی خۆیدا دەیڕوانی، هیچ

کەسو شـــتێکی بەدی نەکرد، کەشو هەوا ئارامو هێمن بوو. کاتێك لە دارســـتان نزیك بووەوە گوێی لە دەنگێك بوو، تا دەهات دەنگەکە نزیکتر دەبووەوە، لە ناکاو قاچەکانی ئاڵا لە داوی جاڵجاڵۆکەیەکەوە، هەرچەنــد هەوڵـــی دا نەیتوانی خۆی ڕزگار بــکات. بە خۆی گوت: ئەمە چی بوو، تۆ بڵێی کەوتبمە نێو داوی جاڵجاڵۆکەوە، لەو ساتەدا جاڵجاڵۆکەکە وەدەرکـــەوتو بە پێکەنینەوە وتـــی: خواردنی ئەم شەوم دەستکەوت، ئەمشەو بە برسێتی نامێنمەوە.

مێروولەکەش قیژاندی گوتی: نەخێر، نەخێر دوورکەوەرەوە لێم، دایە.. دایە... خوشکەکانم، براکانم فریام کەون!!

دایکی مێروولەکە هەســـتی کرد دەنگێك لــە دوورەوە دێت، کاتێك ســـەیری بێچووەکانی کـــرد، زانی یەك لـــە بێچووەکانی ڕۆیشـــتۆتە دەرەوە، لەبەر ئەوە هەمووانی هەڵســـاندو پێکەوە بەرەو دەنگەکە ڕۆیشتن..

کاتێك بینیان وا خوشـــکەکەیان بە دەســـت جاڵجاڵۆکەیەکەوەیە، هەمووان هێرشیان کردە سەر جاڵجاڵۆکەکەو خوشکەکەیان لە دەست دەرهێناو ڕزگاریان کرد، دواتر پێکەوە گەڕانەوە بۆ ماڵەکەی خۆیان.

مێروولەکە ڕووی کـــردە دایکیو خوشـــکو براکانیو داوای لێبوردنی لێکـــردنو پێی وتن: ئیدی هەرگیز بـــە تەنها ناڕۆمە

دەرەوە، ئێستا مانای پێکەوە ڕۆیشتنە دەرەوە دەزانم! ئێستا دەزانم پێکەوە بوونمان واتە پاراســـتنی ژیانمان، ئیـــدی دەزانم ئێوە بۆ مـــن چەندە گرنگن! دەزانم گەر هەمـــووان پێکەوە بین، دوژمن ناتوانێت زیانمان پێ بگەیەنێت! چونکە ئێمە گەر بە تەنها بین، توانای ڕووبەڕووبوونەوەی دوژنمان نییە!

پوختە:

✍ منداڵە خۆشەویستەکان.. ژیانی مرۆڤەکانیش هاوشێوەی ژیانـــی مێروولەکانە، ئێمە ناتوانین بە تەنهـــا ژیان بگوزەرێنین، پێکەوە بونمان مانای جوانتر بە ژیان دەبەخشێو لە زیانو ترسی ناحەزان بەدوور دەبین.

✍ بزانن شەقامو کۆڵانەکان کەسانی ناحەزو ناتەندروستی لێیە، باشـــترە بێ پرسی باوکو دایکمان لەماڵ دوور نەکەوینەوە، چونکە تۆی منداڵ هێشتا ناتوانیت ڕووبەڕووی گرفتو ناڕەحەتیو ئەو بەربەستانە ببیتەوە کە دێنە ڕێت.

✍ پێویســـتە تۆی منداڵ بەرپرسیارانە مامەڵە بکەیتو نرخی پێکـــەوە بوونو ژیانی خێزانیتان بزانیـــت.. دڵنیابە هیچ کەس بە وێنەی دایکو باوکت دڵســـۆزو دۆســـتی تۆ نین! تۆش ڕێزیان لێ بگرەو هەرگیز لەوان دوور نەکەویتەوە.

له دێرزەماندا پادشـــایەك هەبوو، کەســـانی زیرەكو بیرتیژو لێهاتـــووی زۆر خۆش دەویســـت، بـــۆ ئەم مەبەســـتە بەردەوام پرســـیاری لە وەزیرو کەسانی چواردەوری دەکرد، پرسیارگەلێك کە زیرەکی، لە کەسانی نازیرەك جیا دەکردەوە.

ڕۆژێکیان جەنابی پادشـــا، وەزیرە بەتەمەنەکەی بانگهێشت کرد بۆ کۆشـــكو پێی وت: پرســـیارێکت لێ دەکەم، پێنج ڕۆژیش مۆڵەتت پێ دەدەم، ئەگەر لەو ماوەیەدا وەڵامەکەت زانی، ئەوا تۆ لە هەمان پلەوپایەی خۆتدا دەمێنیتەوە، خۆ ئەگەر لەو ماوەیەدا وەڵامەکەت نەزانی، ئەوا تۆ لە پۆســـتەکەت دوور دەخرێیتەوە، واتە: چیدی وەزیر نامێنیت.

پاشان پادشـــا پرسیارەکەی بەم شـــێوەیە ئاڕاستە کرد: ئەوە چییە دەڕواتو قاچی نییە، کاتێکیش ڕۆیشـــت کەس نازانێت بۆ کوێ دەڕوات؟

وەزیرە بەســـاڵاچووەکەی بە بیســـتنی ئەم پرسیارە سەختە نیگـــەران بوو؛ چونکە وەڵامەکەی نەدەزانـــی، بەخەمباری ملی ڕێگەی گرتو گەڕایەوە بۆ ماڵ.

هاوکات جەنابی وەزیر سێ کوڕەزای هەبوو، ڕۆژانە سەردانیان دەکردو هەواڵیان دەپرسی، لەو کاتەدا کوڕەزا گەورەکەی کە بۆ

دیدەنی باپیری هاتبوو، بەپەرۆشـــەوە هەواڵی پرسی، بەڵام بینی باپیری زۆر سـەرقاڵو خـەمبارە، وتی: باپیرە شتێك ڕووی داوە؟

باپیری وتی: پادشـــا پرســـیارێکی قورســـی لێ کـــردووم، کە وەڵامەکەی نازانم، ئەگەر نەشـــتوانم لە ماوەی دیاریکراودا، وەڵام بدەمەوە؛ ئەوا لە پۆستەکەم دوورم دەخاتەوە.

کوڕەزاکەی وتی: پرســـیارەکە چییە، کـــە تۆ ناتوانیت وەڵامی بدەیتەوە؟

باپیری وتـــی: دەڕواتو قاچی نییە، کاتێکیش ڕۆیشـــت کەس نازانێت بۆ کوێ دەڕوات؟

کوڕەزاکەی وتی: خـەمبـــار مەبە، خۆت نیگەران مەکە باپیرە گیان، هەر لە بنەڕەتدا ئەو پرســـیارە وەڵامی نییە؛ چونکە هیچ شتێك بەبێ قاچ ناتوانێت بڕوات، تۆ ئەمڕۆ لە کار ماندوو بوویت، ئێستا کاتی پشووە، کەمێك بە ئارامی چاوەکانت لێك بنێو پشوو بدە.

پاش ئەم وتووێژە کوڕەزای دووەمی هات بۆ لای بە مەبەســـتی دیدەنیو هەواڵپرســـین، دووبارە ئەویـــش کاتێك چاوی بە باپیری کەوت، کە خەمبارو بێتاقەتە، لە هۆکارەکەی پرســـی، باپیریشی چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە.

کوڕەزای دووەمیشی بە هەمان شێوە وتی، هیچ شتێك بەبێ قاچ ناڕوات، ئەم پرسیارە بەهانەیە، پادشا دەیەوێت لە پۆستەکەت دوورت بخاتەوە، ئەمەی کردووە بە بیانوو.

بۆ ڕۆژی دواتر کوڕەزای سێیەمی سەردانی باپیری کرد، بە هەمان شێوەی ڕۆژی پێشوو چیرۆکەکەی بۆ کوڕەزای سێهەمی گێڕایەوە.

ئەم کوڕەزایەی جیاواز لەوانی دیکە، بە باپیری وت: باپیرە سێ ڕۆژ مۆڵەتم پێ بدە بۆ دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارەکە، دواتر کوڕەزاکەی باپیری جێهێشت و بە شوێن وەڵامی پرسیارەکەدا ڕۆیشت بۆ کتێبخانەی شارو بە نێو پەڕاوەکانی کتێبەکاندا عەودالی دۆزینەوەی وەڵامی پرسیارەکە بوو.

سێ ڕۆژ تەواو بوو، کوڕەزاکەی بە دڵخۆشییەوە گەڕایەوە بۆ لای باپیری، پێی وت: باپیرە گیان نیگەران مەبە، وەڵامەکەم دۆزییەوە، باپیری لە خۆشیدا شاگەشکە بوو، وتی: کوڕم پێم بڵێ، وەڵامەکە چییە؟

کوڕەزاکەی وتی: باپیرە (خۆر ڕووناکی دەبەخشێت، ڕووناکییەکەیشی دەڕوات بۆ هەر جێگەیەك بیەوێت، قاچیشی نییە، کاتێك ڕووناکییەکەی دەڕوات، کەس نازانێت بۆ کوێ دەڕوات).

هەمووان لە خۆشـــیدا بە یەك دەنـــگ هاواریان کردو وتیان: قاچی نییەو دەڕواتو کەس نازانێت بۆ کوێ دەڕوات.

دواتـــر باپیری بـــە کوڕەزاکەی وت: کوڕم چـــۆن توانیت ئەم وەڵامە دەست بخەیت؟

کوڕەزاکەی وتی: لەو ســـێ ڕۆژەدا سێ کتێبم خوێندەوە، لەو کتێبانەدا وەڵامی پرسیارەکەم دەست کەوت.

جەنابی وەزیر وتی: زانســـت ڕووناکییە، پەرتووکیش نهێنی بەختەوەرییە.

جەنابی وەزیر زۆر بە دڵخۆشـــییەوە ملی ڕێگەی بەرەو کۆشکی پاشا گرتەبەر، چووە لای پادشاو وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە، بەمەش لە پۆســـتەکەی خۆیدا مایەوە، بەڵام لـــەو ڕۆژە بەدواوە هەرگیز لـــە کتێـــبو خوێندنەوە دانەبـــڕا، کتێب بووە هـــاوڕێو هاودەمی هەمیشەیی؛ چونکە کتێب بووە هۆکاری مانەوەی لە پۆستەکەیدا.

پوختە:

✍ وەڵامی هەموو پرسیارە ئاستەمەکان لە نێو کتێبەکاندا دەست دەکەوێت، کەواتە تۆش ببە بە هاوڕێی کتێبو هەرگیز لێی دامەبڕێ..

✍مرۆڤ لە هەر پلەو پایەیەکدا بێت، پێویســـتی بە زانســـتو زانیاری نێو کتێبەکان هەیە! زانست خوازبە، لە بێشکەوە تامردن!



درۆ هەر درۆیە،

با یەك وشەش بێت!

لە دێر زەماندا، شازادەیەك هەبوو، پادشای باوكی كۆچی دوایی دەكاتو ماڵاوایی لە ژیان دەكات، شا تەنها شازادەیەكی مێردمنداڵی لە دوای خۆی جێهێشـــت، بەڵام لە پێش مردنیدا مامۆســـتایەكی تایبەتـــی بۆ دابین كردبوو؛ بۆئەوەی فێری وانەكانی ژیانی بكاتو بـــەردەوام چاودێری بكات، بەمەبەســـتی پاراســـتنی لە ناحەزو دوژمنەكانی، تا ئەو كاتەی بەتەواوی گەورە دەبێت.

كاتێكیش شـــازادە بە تەواوی گەورە بـــوو، داوای لە جەنابی مامۆســـتا كردو پێی گوت: تكایە جێم مەهێڵە، باوكم وەســـیەتی بـــۆ كردووم، كە هەرگیز واز لـــە ئامۆژگاریو حیكمەتەكانی تۆ نەهێنـــم؛ چونكە تـــۆ پەروەردەكارێكی لێهاتوویـــت، زیاتر فێری وانەكانی ژیانم بكە، جەنابی مامۆستاش داواكارییەكەی شازادەی پەســـەند كردو لە كۆشكدا لەگەڵ شازادەدا مایەوە؛ تا بەردەوام وانەی داناییو حیكمەتی فێر بكات.

ڕۆژێكیان شـــازادە لەگـــەڵ پیاوماقووڵانی شـــار كۆبوویەوە، لە دانیشـــتنەكەدا مامۆســـتاكەی ئامادەبوو، بەڵام جگـــە لە چاودێریی شازادە هیچ قسەیەكی نەكرد، دوای ئەوەی كۆبوونەوەكە تەواو بوو، پیاوماقووڵانی شار كۆشكیان جێ هێشتو لە دیوەخانی كۆشكدا، تەنها مامۆستاو شازادە مانەوە، شـــازادە بە مامۆستاكەی گوت: بۆچوونت چی بوو لەسەر دانیشتنی ئەمڕۆمان لەگەڵ پیاوماقووڵانی شار؟

مامۆســـتاكەی گوتی: زۆر بەداخەوە، قســـەكانت جوان بوون،

بەڵام ببوورە قســـەیەکت کرد کە ڕاست نەبوو! شازادە دەستی بە پێکەنین کردو گوتی: تەنها قســـەیەك هیچ نییـــە، واتە: درۆیەك بە تەنها کێشـــە نییە، شـــازادە ئەو ڕۆژەی بەڕێ کردو شـــەوگار داهات، ڕۆیشـــتە ژووری نووســـتنەکەی‌و بەئارامی خەوت، بەڵام مامۆستا ئەو شەوە خەو نەچووە چاوەکانی؛ چونکە هەستی دەکرد بەشێکی تاوانی ئەو درۆیە، دەکەوێتە سەرشانی ئەو؛ لەبەرئەوەی شازادە لەسەردەستی مامۆســـتا پەروەردە بووە، بەردەوام بیری لە ڕێچارەیەك دەکردەوە، تا شـــازادە فێر بـــکات، درۆ ئەگەرچی کەم بێت، یان بچووك بێت، هەر پێی دەگوترێت درۆ. چونکە مرۆڤ لە درۆیەکەوە فێری درۆی زۆرترو گەورەتر دەبێت. کاتێك بۆ سبەی خۆرهەڵات، مامۆســـتا لە ژوورەکەی چووە دەرەوەو ڕۆیشـــت بۆ گەنجینە ئاڵتوونییەکەی پادشا، سکەیەکی ئاڵتوونی لە گەنجینەکە هەڵگرت، دەرگای خەزێنەکەی داخســـتەوەو بـــەرەو ژوورەکەی خۆی گەڕایەوە، لە کاتی گەڕانەوەیدا پاســـەوانێکی پاشا چاوی پێ کەوت‌و بینی سکەیەکی ئاڵتوونی پێیە، بە پەلە خۆی گەیاندە لای پادشاو پێی گوت: کە مامۆستاکەی سکەیەکی ئاڵتوونی هەڵگرتووە!

پادشا گوتی: مامۆســـتام بۆ بانگهێشت بکەن، مامۆستا هات بۆ لای پادشا، جەنابی پادشـــا بەتووڕەییەوە گوتی: تەواوی سامان‌و ســـەروەت‌و سامانم خســـتۆتە بەردەســـتت، هیچ پاساوێك نییە؛ بۆئەوەی ناچاربیت دزی لە ماڵی من بکەیت! هەر لە منداڵیمەوە

تۆ منت لەسەر ئەمانەتو دەستپاکی، پەروەردە کردووە. کەواتە: چۆن بوو، تۆ سکەیەکت لە گەنجینەی من دزیوە؟

مامۆستاکەی زۆر بەئارامی وەڵامی دایەوەو گوتی: جەنابی پادشا، ئەوە بە دزی لە قەڵەم نادرێت؛ چونکە من لە هەموو گەنجینەکەی تۆ، تەنها یەك سکەم هەڵگرتووە!

پادشا گوتی: دزی هەر دزییە! ئەو کەسەی یەك سکە هەڵدەگرێت، پێی دەگوترێت دز، ئەو کەسەشی هەموو سکەو گەنجینەکە دەدزێت، هەر پێی دەڵێن دز! لێرەدا مامۆستا هەستی کرد پلانەکەی سەری گرتووە، لەبەرئەوە زەردەخەنەیەکی کردو سکە ئاڵتوونییەکەی لە گیرفانی دەرهێناو فڕێی دایە بەردەمی پادشاو پێی گوت: جەنابی پادشا، درۆش هەر درۆیە، گەرچی یەك وشەش بێت، ئەو کەسەی یەك وشە بە درۆ دەردەبڕێت، وەکو ئەوە وایە لە هەموو قسەکانیدا درۆی کردووە! تۆش دوێنێ یەك درۆت کرد، دواتر گوتت: تەنها درۆیەك زیانی نییە. . منیش بەم ڕێگەیە ویستم وانەیەکت فێربکەم! پادشا وێڕای ئەوەی داوای لێبوردنی لە مامۆستاکەی کرد، هاوکات زۆر سوپاسی پەندو ئامۆژگارییەکەی کردو لەو ڕۆژە بەدواوە، تەنها پیتێکیشی بە درۆ دەرنەدەبڕی!

پوختە:

✍ منداڵە ئەزیزەکان.. پێویستە هەمیشە خۆمان لە درۆکردن بپارێزین، چونکە مرۆڤ لە درۆیەکەوە فێری درۆکردن دەبێت!

هەموو ڕۆژانێکی هەینی، نەوەکانیان دەهاتنەوە بۆ لایانو ئەو ڕۆژەیان بە کۆمەڵ لە ماڵی باپیرەو داپیرە زۆر بەخۆشی بەسەر دەبرد.. هێژا زۆر حەزی بە ڕۆژانی هەینی دەکرد، لەبەرئەوەی چــاوی بە کچــە مامەکەی نێرگــزو کچەپوورەکەی ســـەناریا دەکەوتو ئەو ڕۆژەیان پێکەوە بەســـەر دەبردو لە ماڵی داپیرەو باپیرەیان، بە یاریو گاڵتەکردنو قسەی خۆش، تا خۆراوابوون بە خۆشی بەسەر دەبرد..

هەینییەکیان هەمــوان ئامادەبوون، بەڵام باوکی نێرگز هاتو نێرگزی لەگەڵدا نەبوو، هێژاو ســـەناریا بەپەرۆشەوە ڕۆیشتن بــۆ لای مامەیانو پێیان گوت: مامەگیان نێرگز لە کوێیە؟ بۆچی لەگەڵ خۆتدا نەتهێناوە؟

مامەیان گوتی: گوڵەکانم، نێرگز چووەتە خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی، ڕەنگە کەمێکی دیکە لەگەڵ دایکیدا بێت بۆ لاتان.

ســـەناریا گوتی: بۆچی ئینگلیزی دەخوێنێت، زمانی ئینگلیزی زمانێکی قورسو نامۆیە؟

مامی گوتی: نا، ســـەناریا.. هیچ شـــتێك بۆ فێربوون قورس نییە، مرۆڤ گەر بیەوێت شتێك بە دەست بهێنێت، گەر ورەی بەرز بێتو متمانـــەی بە خۆی هەبێت، بە دڵنیاییەوە دەتوانێت فێربێت، لەگەڵ ئەوەشدا فێربوونی زمان بەسوودەو مرۆڤ چێژی لێ دەبینێت.

هێژا گوتی: مامە بۆچی؟ ئایا زمانی دایك بەس نییە، قسەی پێ

بکەین‌و تێیدا شارەزا بین؟ بۆچی زمانی بێگانە فێر ببین؟

مامی گوتـــی: نەخێر، بەڵکو فێربوونی زمانـــی دیکە، وات لێ دەکات، بتوانیت ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە، کە بە زمانی ئینگلیزی نوسراون، دەتوانیت سوود لە زانستو ئەزموونی گەلانی جیهان وەربگریت، مرۆڤ چەند زمان بزانێت؛ ئەوەندە کەسە!

لەو کاتەدا نێرگز لەگەڵ دایکیدا هاتن بۆ ماڵی باپیرەو سڵاوی لێکردن.

هەموان بەخێرهاتنیان کردن‌و بەگەرمی وەڵامی سڵاوەکەیان دایەوەو هەواڵی خولەکەیان لێ پرسی‌و پێیان گوت: ئایا وانەکانت قورسە؟

نێرگز گوتی: بە پێچەوانەوە، وانەکانمان زۆر بەسوودن، من زۆر سوودم لەو خولە بینیوە..

ئیدی ســـەناریا گوتی: منیش بە باوکم دەڵێم: کە مۆڵەتم بدات لەگەڵ تۆ بێم بۆ خولی فێربوونی زمانی ئینگلیزی..

بەڵام هێژا حەزی نەکرد، بەشـــداری خولەکە بکات، وتی: من هەست دەکەم، کە زمانی ئینگلیزی بۆ من سوودی نییە.

ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، سەناریاو نێرگز، پێکەوە دەڕۆیشتن بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزی‌و گرنگیی زۆریان پێ دەداو زۆر سوودیان لێ دەبینی‌و دواجار دەیانتوانی پێکەوە بە زمانی ئینگلیزی بدوێن..

ڕۆژێکی هەینـــی، هەروەکو نەریتی خۆیان، لـــە ماڵی باپیرەو

داپیره کۆبوونەوە، کچان پێکەوە لەگەڵ پشیلەکەیان لە باخچەی ماڵەکەیان یارییان دەکرد، هێژا قوتوویەکی دۆزییەوە لەسەری نووسرابوو (This Eating For Cats)، هێژا نەیزانی ئەوە چ مانایەکی هەیە، کەلەسەر قووتوەکە نووسراوە، سەیری کرد ناو قوتوەکە خواردنی تێدایە، دەستی کرد بە خواردنی بە لایەوە خواردنێکی بەتامو خۆش بوو، بانگی سەناریاو نێرگزی کردو گوتی: سەیرکەن چیم دۆزییەوە، خواردنێکی زۆر خۆشو بەتامە لێی بخۆن، بزانن چەند خۆشە!

بەلام کاتێك سەناریاو نێرگز سەیری قوتووەکەیان کردو نووسینەکەیان خوێندەوە، گوتیان: هێژا، ئەمە خواردنی ئێمە نییە، خواردنی پشیلەیە، ئایا لێت خواردووە؟

پێش ئەوەی وەلام بداتەوەو بلێت: بەڵێ، هاواری کرد ئای سکم، ئای سکم، ئاهـ.. ئاهـ.. دایکی بەدەمییەوە هاتو بەپەلە بردی بۆ نەخۆشخانە.. ئەو کاتە بیری کردەوەو گوتی: ئەگەر منیش لەگەڵ نێرگزو سەناریادا بڕۆیشتمایە بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی؛ ئەوا خواردنی پشیلەکەم نەدەخوارد!!

پوختە:

مرۆڤ چەند زمان بزانێت، ئەوەندە کەسە، بە تایبەت زمانی ئینگلیزیو عەرەبی، زۆر پێویستە هەمووان هەوڵ بدەین، خۆمان فێری ئەو دوو زمانە بکەین!

جارێکیان کێشـــەیەکی گەورە کەوتـــە نێوان ئەندامانی هەر پێنج هەســـتەوەرەکانەوە، کە پێکهاتوون لە چاوو گوێو زمانو لووتو پێست!! هەر یەك لەوان دەیانەویست، خۆیان بە چاکتر لەوانی دیکە نیشان بدەن، پرسیارەکەی کە لایان درووست بوو ئەمە بوو: کێ لە هەموان گرنگترە؟

* ســـەرەتا چاو قســـەی کردو گوتی: من گرنگترین ئەندامم لە جەســـتەی مرۆڤدا، مرۆڤ بە هۆی منەوە، هەموو شتەکانی دەوروبەری دەبینێت، ئەگەر شتێکی ترسناکی بینی، هەر بەهۆی منەوە دەیبینێتو لێی دوور دەکەوێتەوە..

* دواتر زمان هاتە گۆو گوتی: نەخێر، من گرنگترین ئەندامی جەســـتەم؛ چونکە ئەگەر من نەبم، مرۆڤ ناتوانێت بە ڕوونی ئەو شتە بڵێت، کە دەیەوێت!

* پاشـــان گوێچکە هاتە قســـەو گوتی: نەخێر من هاوڕا نیم لەگەڵتاندا؛ چونکە من پێم وایە، کە گرنگترین ئەندامی جەستەی مرۆڤ منم، نەك ئێوە، بەڵگەشـــم بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە، ئەگەر مـــن نەبم مرۆڤ ناتوانێت لە کەســـانی دەوروبـــەری تێ بگاتو بەئاســـانی وەڵامی قسەکانیان بداتەوە ، بەبێ بوونی من، مرۆڤ ناتوانێت تێبگاتو وەڵامی قسەی دەوروبەری بداتەوە.

* لەولاوە لووت نەیتوانی لەوە زیاتر بێدەنگ بێت، لەبەرئەوە دەســـتی بە قســـەکردن کردو گوتی: ئایا ســـوودەکانی منتان، بۆ

ژیانی مــرۆڤ لە یاد کردووە؟! ئەوە منم بۆنی خۆش هەڵدەمژمو دەروونی مرۆڤ ئاســوودەو خۆشــحاڵ دەکــەم، هەروەها بۆنی ناخۆشــیش هەڵدەمژم؛ تا مرۆڤ خۆی لــێ دوور بخاتەوە! ئەوە منم هەســت بە بۆنە ترســناکەکان دەکەم؛ تا مــرۆڤ بەپەلە بەدەمییەوە بڕواتو چارەسەری بکات.

* لــە دوای هەمووان پێســت هاتە قســەکردنو گوتی: من گرنگترین ئەندامی جەســتەم، ئەوە منم چواردەوری جەستەی مرۆڤم داوە، منم مرۆڤ لە هەموو شتێکی زیانبەخش، لە سەرماو گەرما، لە میکرۆبە زیانبەخشەکان، دەپارێزم، ئەوە منم خوێنو ئێسقانی مرۆڤم داپۆشیوە.

دوای ئەم مشــتومڕە، چــاو گوتی: هاوڕێیان بــا کەمێك بیر بکەینەوە، هەر یەك لە ئێمە، پێویستــیمان بە یەکتر هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر من شتێك ببینم، ناتوانم باسی لێوە بکەم، بێگومان دەبێت زمانی هاوڕێم ئەو دیمەنەی من دیتومە لەبارەیەوە بدوێ!

کاتێکیش زمان دەیەوێت قســە بکات، ناتوانێت قســە بکاتو وەڵامــی کەســی بەرامبەر بداتــەوە، ئەگەر گوێی لە قســەی بەرامبەر نەبێت، بێگومان گوێچکە کرداری بیستنو تێگەیشتن لە بەرامبەر ئەنجام دەدات، پاشــان زمان دەتوانێت قسە بکاتو وەڵام بداتەوە.. پاشان لووت، با خۆشترین بۆنی دونیا هەڵبمژێت، با ئەو بۆنانە هەڵبمژێت کە مرۆڤ حەیرانو سەرســام دەکەن،

باشـــه دواتر چۆن دەتوانێت، باس لەو ساتە خۆش‌و بۆنە خۆشە بکات، ئەگەر زمان ئەو خۆشـــحاڵییە دەرنەبڕێت‌و باســـی لێوە نەکات؟؟!! خۆئەگەر پێســـت جەستەی مرۆڤ لەسەرماو گەرما نەپارێزێت؛ ئەوا هەموو جەســـتە بەجارێك نەخۆش دەکەوێت، ئەو کات هیچمان ناتوانین بە باشـــی کارەکانمان بەڕێوە ببەین، کەواتە: هەموومان پێویستمان بە یەکترەو هەموان تەواوکەری یەکترین..

ئیدی هەموان پێکەوە سوپاســـی (چاو)یان کردو دەستخۆشی‌و ئافەرینیـــان لێکرد، دواتر پێیان گوت: بەڕاســـتی تۆ داهێنانت لە ژیـــری‌و بیرکردنەوەمانـــدا کردو هەمووانت بەئـــاگا هێنایەوەو وانەیەکی بەسوودت فێرکردین.

پاشـــان هەســـتەوەرەکان ڕێك کەوتن، کە پێکەوە هاوکاری یەکتر بن‌و پشـــتی یەکتر بگرن بـــۆ خزمەتی مرۆڤ، هەمووان بەڵێنیـــان دا، کە هەرگیز جارێکی دیکە، ڕێگە نەدەن کێشـــەو دووبەرەکـــی بکەوێتە نێوانیانەوە؛ بۆئەوەی هەســـتەوەرەکانی مرۆڤ بەهۆی جیاوازیی نێوانیانەوە لەکار نەکەون!

پوختە:

هەموومـــان پێکەوە جوانیـــن، هەرگیز ناتوانین یەکتری فەرامـــۆش بکەیـــن، هەموومان لـــەم ژیانەدا گرنگیـــن، پێکەوە دەتوانین کاروبارەکان بەڕێوەبەرین.

لە دێرزەمانـــدا، تووتییەك لە نێو دارســـتانێکی پڕ لە باڵندەی جوانو نەخشـــینو دەنگخـــۆش، ژیانی دەگوزەرانـــد، تووتییەکە لەســـەر درەختێکی گەورەی دارســـتانەکە، هێلانەی درووســـت کردبوو، لەســـەر هەمان درەخت، هێلانـــەی مام کۆترو چۆلەکە پاساریشی لێ بوو.

ڕۆژێکیان تووتییەکە، ســـەردانیماڵی چۆلەکە پاساری کردو لەبارەی مام کۆترەوە قسەی بۆ کرد، بە چۆلەکەی گوت: مام کۆتر، باڵندەیەکی لە خۆبایییە، لەبەرئەوە نامەوێت لەگەڵ کۆتردا ژیان بگوزەرێنێم، دەنگێکی ناخۆشـــی هەیەو ناهێڵێت بەشـــەو پشوو بدەمو بە ئارامی بخەوم.

چۆلەکەپاسارییەکە گوتی: بەڵام کۆتر باڵندەیەکی خۆشەویستە لای هەمووان، هیچ کات نەبووەتە مایەی بێزاری بۆ دراوسێکانی!

تووتـــی گوتی: بەڵام من ڕۆژێکیـــان گوێم لێ بوو، کۆتر دەیگوت: چۆلەکەپاســـاری باڵندەیەکـــی بچکۆلانەیەو هیچ ســـوودێکی نییە! دەنگێکی بێزارکەری هەیەو پێویســـتە پلانێك دابنێین؛ تا لەســـەر درەختەکە دەریان بکەین! بەبیســـتنی ئەم قســـانە، چۆلەکەپاساری زۆر تووڕەبـــوو، کەوتە بیرکردنـــەوە؛ بۆئەوەی پلانێـــك دابنێ، تا کۆترەکە دەربکات!

پاش ئەم وتوێژە تووتی دای لە شـــەقەی باڵو ڕۆیشـــت بۆ ماڵی کۆترەکە، پێی گوت: چۆلەکە پاســـارییەکان هێلانەی زۆریان لەسەر

درەختەکە کردووە، خەریکە تەواوی درەختەکەمان لێ داگیر بکەن!

کۆترەکە گوتی: بەڵام چۆلەکە پاسارییەکان، باڵندەیەکی جوانو بەسوودنو هیچ زیانێکیان نییە.

تووتییەکە گوتی: بەڵام من گوێم لە چۆلەکە پاساری بوو، کە دەیگوت: کۆترەکان باڵندەیەکی بێزارکەرنو هێلانەکانیان گەورەنو پێویستە ئەوان دەربکەین.. کۆترەکە بە بیستنی ئەم قسانە، زۆر تووڕەبوو، بڕیاری دا کە چۆلەکە پاساری لە هێلانەکەی خۆی دەربکات.

ڕۆژێك هەموو باڵندەکان کۆبوونەوە، کۆترەکان بە چۆلەکەپاسارییەکانیان گوت: ئێوە زۆر خراپن، نامانەوێت لەمەودوا ئێوە لەگەڵ ئێمەدا بژین، چۆلەکە پاسارییەکان وەڵامیان دانەوەو گوتیان: ئێوە خراپترین باڵندەی دارستانن؛ چونکە ئێوە دەتانەوێت، ئێمە لە ماڵەکانی خۆمان دەربکەنو هێلانەکانمان تێك بدەن!

لەو لاوە تووتییە دووڕووەکە، زۆر بە خۆشحاڵییەوە سەیری دیمەنەکەی دەکرد!

لەو کاتەدا چۆلەکە پاساری گوتی: تووتی بە ئێمەی گوت: کە ئێوە ئێمەتان خۆشناوێت! کۆترەکە بەبیستنی ئەم قسەیە سەرسام بوو، وەڵامی دایەوەو گوتی: خۆ تووتی بە ئێمەی گوت: کە چۆلەکەپاسارییەکان دەیانەوێت دەرتان بکەنو ماڵەکانتان داگیربکەن!

کۆترو چۆلەکەپاسارییەکان ئاوڕیان دایەوە بۆلای تووتییەکەو کەمێك تێڕامان، بیریان لە قسەکانی توتی کردەوە!

تووتییەکــە بە گڵدۆ گڵدۆ گوتی: من.. مــن.. نانا من هیچم نەگوتووە! ئــەو کات کۆترەکانو چۆلەکەپاســارییەکان، بۆیان دەرکەوت کە تووتییەکە دەیەوێت بەشــەڕیان بداتو نێوانیان تێك بــدات! چونکە تووتییەکە باڵندەیەکی دووڕوو بوو، حەزی بە کێشەو ئاژاوەی نێوان دراوسێکانی دەکرد!

هەردووکیــان پێکــەوە پەلامــاری تووتیــی دووڕوویــان داو لــە درەختەکــە وەدەریــان نــاو، هێلانەکەیــان تێــك دا! ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، کۆترو چۆلەکە پێکەوە بەئاسوودەیی‌و دوور لە ناخۆشی، بە ئارامی ژیانیان پێکەوە بەسەر دەبرد!

کۆترو چۆلەکە، ژیرانە بیریان کردەوە، پێش ئەوەی بە قسەی تووتی دووڕوو بکەونــە گیانی یەکتری، توانییــان حەکیمانە، دەستە خراپو ئاژاوەگێڕەکەی نێوانیان دوور بخەنەوە!

پوختە: منداڵە چاوگەشەکان، هیوادارم ئێوەش لەم چیرۆکە پەند وەرگــرن، هــەر کات هاوڕێیەکتان ویســتی نێوان تۆو هاوڕێکــەت تێك بدات، ســەرەتا بڕۆ بــۆ لای هاوڕێکەتو لە ڕاســتو درووستی قســەکان بکۆڵەرەوە، نەکەی هەرگیز بە قسەی ناحەز فریو بخۆیتو خۆت دوچاری دەردەسەری‌و ئاژاوەو ناڕەحەتی بکەیت!

لــە دێــر زەمانــدا، ڕاوچییەك هەبــوو، هەمــوو ڕۆژێك بۆ پەیداكردنــی بژێوی ژیانی خــۆیو خانەوادەكــەی، دەچووە نێو دەریاو چەند ماسییەكی ڕاو دەكردو دەیبرد بۆ بازاڕو دەیفرۆشت، بە پارەكەی پێداویســتییەكانی ژیانو خۆراكــی دەكڕی، ڕۆژێك لە كاتــی ڕاوكردندا، لەو كاتەی كە لە نێوەڕاســتی دەریادا بوو، بایەكی بەهێز هەڵی كردو نزیك بوو بەلەمەكەی تێك بشكێنێت، ڕاوچییەكە لێزانانــە هەوڵی خۆكۆنترۆڵكردنی داو ئاڕاســتەی بەلەمەكەی بە هاوشــێوەی ئاڕاســتەی باكە جووڵاند، ئەو ڕۆژە بۆ ڕاوچییەكە زۆر سەخت بوو، هەرچەندە هاواری دەكرد، هیچ كــەس نەبوو، بە هاوارییەوە بێت، ڕاوچی لەو بڕوایەدا بوو، كە ئەوە دوارۆژی ژیانییەتیو لە دواساتەكانی تەمەنیدایە، هاوكات بەدەم شــەپۆلەكانی ئاوەكەوە، ململانێی لەگەڵ ئاوەكەدا دەكرد، وەكوو ئەوەی نیشــانی بدات، تا ئەو كاتەی دەتوانێت، بەئاســانی تەسلیمی مەرگ نابێت، لەو ساتەدا چاوی كەوت بە دوورگەیەك كە چەند سەد مەترێكی مابوو، پێی بگات، هەرچۆنێك بێت خۆی گەیانــدە دوورگەكە، لە بەلەمەكەی دابــەزیو بەلەمەكەی بە درەختێكی نزیك كەناراوەكەوە بەســتەوە، پاشان دەستی كرد بە گەڕان، بەو هیوایەی شتێك بدۆزێتەوە، بیخوات.

لەنـــاكاو كەوتە نێو ئاپـــۆڕای جەمـــاوەرەوە، هەموو خەڵكی دوورگەكە لەو كاتەدا كۆببوونەوەو چاوەڕوانی هاتنی پادشـــای جەنگاوەریان دەكرد؛ تا بێتو هاوكارییان بكاتو ببێتە پادشایان، لەو كاتەدا كە چاویان بەڕاوچی لێقەوماو كەوت، هەموو پێكەوە هاواریان كرد: پادشای جەنگاوەر هات، یارمەتیمان پێگەیشت!

هەر چەندە ڕاوچییەكە، نەیدەزانی چی ڕوودەدات، بەڵام ئەوان بە پێشوازییەكی گەرمەوە، بەرەو مەیدانی ئاهەنگەكەیان بردو ئاهەنگی پێشـــوازییان بۆ ســـازكردو جۆرەها خواردنی بەتامییان پێشكەش كرد!

كاكـــی ڕاوچی لـــە خۆشـــیدا نەیدەزانی ئەمـــە خەونە، یان خەیاڵە، یاخود ڕاســـتی.. لـــە ناكاو لە ڕاوچێتییـــەوە، بووە بە پادشای دوورگەیەكو ژیانێكی شاهانە دەگوزەرێنێت، لەبەرئەوە ڕاســـتییەكەی بۆ باس نەكردن، پێـــی نەگوتن كە ئەو ڕاوچییە، نەك پادشا!

ئیدی لـــەو ڕۆژە بەدواوە، وەكو پادشـــا حوكمی دەكرد، بەڵام نەیدەزانـــی مەبەســـتی خەڵكی دوورگەكە چییـــە.. لەوەی كە دەیان گوت: پادشای فریادڕەسە!

ژیانی ڕاوچـــی، بەمجۆرە بەردەوام بـــوو، ڕۆژەكان تێپەڕین،

ڕۆژێکیان کە جەنابی ڕاوچی، لەگەڵ خەڵکی دوورگەکەدا دانیشتبوون، نانیان دەخواردو بەخۆشی کاتیان بەسەر دەبرد، لەو کاتەدا پیاوێك هاتو پێی گوتن: من پادشای جەنگاوەرم، خەڵکەکە بەبیستنی ئەم قسەیە سەرسام بوون، هەمووان بە سەرسامییەوە بۆ کاکی ڕاوچییان ڕوانیو چاوەکانیان ئەبڵەق ببوون، ڕوویان لە ڕاوچییەکە کردو پێیان گوت: کەواتە: تۆ کێیت؟ ئەگەر ئەو کەسە پادشای جەنگاوەرە؟! ڕاوچییەکە گوتی: نەخێر منم پادشا، ئەو پیاوە درۆ دەکات!

ئیدی خەڵکی سەیری ئەو دووانەیان دەکرد، ئەویان دەیگوت: من پادشام، ئەمیان دەیگوت: نەخێر من پادشام، ئەویان دەیگوت: تۆ درۆ دەکەیت، ئەمیان دەیگوت: نەخێر، تۆ درۆ دەکەیت!

خەڵکی دوورگەکە پیاوێکی دانایان هەبوو، کاتێك بەم مشتومڕەی زانی، گوتی: تاکە چارەسەر بۆ ئەوەی بزانین کامیان ڕاست دەکەن، ئەوەیە کە سبەینێ دڕندەکە هێرش دەکاتە سەر دوورگەکەمان، کام لەم دوو کەسە توانی سەر بکەوێت بەسەریداو بتوانێت دڕندەکە بکوژێت، ئەوەیان پادشایە!

کاتێك ڕاوچییەکە گوێی لە قسەی حەکیمەکە بوو، هاواری کرد: ئەو ڕاست دەکات ئەو پادشای جەنگاوەرە، لە ڕاستیدا من

ڕاوچیم لە ڕۆژێکی سەختدا لە دەریا بایەکی بەهێز هەڵی کردو ڕێم کەوتە ئەم دوورگەیە، من پادشـــا نیم! ئێســـتاش دەمەوێت بگەڕێمەوە مەملەکەتەکەی خۆم، من پادشا نیم، بەڵکو ڕاوچیم!

حەکیمەکە گوتی: کەواتە تۆ درۆت کردو ئەو پیاوە ڕاستی کرد!

پادشـــای جەنگاوەریش گوتـــی: لەبەرئـــەوەی درۆی کردووە لەگەڵتاندا، بیگرن بیخەنە بەندیخانە! ڕاوچییەکە زۆر پەشیمان بـــوو لـــەوەی درۆی کردبوو، لەگـــەڵ خەڵکـــی دوورگەکەداو ڕاستییەکەی لێ شاردبوونەوە..

پوختە:

ئازیزانم لێرەدا ئەم پەندە کوردییەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە دەڵێت: پەتی درۆ کورتە! تکایە هەرگیز درۆ مەکەن، چونکە ئەمڕۆ، یان سبەی درۆکەت ئاشکرا دەبێتو دووجاری دەردەسەری دەبیت.. ئەمە جگە لەوەی بە درۆزن دەناسرێیت.

دڵنیابن، سەرفرازیو ڕزگاربوون لە ڕاستگۆییدایە!

لەنێو دارســـتانێکدا، گیانلەبەرەکان پێکەوە ژیانیان بەســـەر دەبرد، هەر یەك لەوان، هاوڕێیەکی هەبوو، کە پێکەوە دەڕۆیشتن بۆ دەشتودەرو هەردو کەژوکێو، لەنێو ئەو دارستانەدا، سەگێك هەبوو، نـــاوی بۆبی بوو، لەگەڵ ڕێویی دارســـتانەکەدا، بووبوو بە هـــاوڕێ، بۆبی ســـەگێکی بەوەفاو ژیر بـــوو، ڕێویش فێڵبازو تەڵەکەچی، زۆرێك لە گیاندارانی دارســـتان، ئامۆژگاریی بۆبیی بەوەفایان دەکـــردو پێیان دەگوت: ڕێوی گیاندارێکی فێڵبازە، ئەو لەسەر سرووشـــتی فێڵبازیو تەڵەکەبازی ڕاهاتووە، بە جۆرێك کە ناتوانێت دەســـتبەرداری بێت، تکایە هاوڕێیەتی مەکە، بەڵام بۆبی نەیدەویست، لە ڕێویی هاوڕێی دوور بکەوێتەوە.

ڕێوییەکـــە زۆرجار، بەخراپە کەڵکی لـــە هاوڕێیەتیی نێوان خـــۆیو بۆبی وەردەگرت، هەر جارێك بۆبی بۆ ســـەردانی ڕێویی هاوڕێی بڕۆیشـــتایە، ڕێوی دەیگوت: بۆبیـــی هاوڕێم، من کەمێك ناساغم، تکایە تۆ ماڵەکەم بۆ خاوێن بکەرەوە؛ چونکە من ناتوانم ئـــەو کارە بکەم، بۆبی دەیگوت: کێشـــە نییە، مـــن ماڵەکە پاك دەکەمەوە!

زۆر جاریش ڕێوی فێڵباز دەچوو بۆ ســـەردانی بۆبی، دەیگوت: هیچ خواردنێك لە ماڵمان نەماوە، هاتووم؛ تا شـــتێکم پێ بدەیت،

بخۆم. بۆبی بەوپەڕی ڕووخۆشـــییەوە، پێشـــوازی لێ دەکردو خواردنی پێ دەدا!

ئیـــدی ڕێویی تەڵەکەباز، بەم شـــێوەیە فێڵی لە بۆبیی بەوەفا دەکرد، ڕۆکی کە ســـەگێکی نزیك لـــە بۆبی بوو، هەروەها بۆبی زۆر خۆش دەویســـت، ویســـتی بۆ بۆبی هاوڕێی ڕوون بکاتەوە، کە ڕێوی فێڵبازو تەڵەکەبازو بەرژەوەندیی پەرســـتە، شـــایانی هاوڕێیەتی بۆبیو ئەو هەموو چاکەو وەفادارییە نییە، کە بۆبی بۆی ئەنجام دەدات.

لەبەرئەوە ڕۆکی بیری لە پلانێك کردەوە؛ تا بۆبی تێ بگەیەنێت، کە ڕێوی، هاوڕێیەکی باش نییە، بۆئەم مەبەستە ڕۆیشت بۆ لای بۆبیو پێی گوت: کارێکی باشم بۆ پەیدا کردوویت!

بۆبی گوتی: چ کارێك؟ ڕۆکی گوتی: پاسەوانی کۆمەڵێك بەرخ، وەکو شوان ئاگاداریان بیتو بیانپارێزیت؟ ئایا دەتەوێت ببیت بە شوانیان؟

بۆبی گوتی: بەڵێ، زۆرباشە، ئەوە کارێکی ئاسانە!

بۆ بەیانی بۆبی ڕۆیشت بۆ سەر کارە نوێیەکەو بوو بە شوانی بەرخەکان، دوای ماوەیەك کاتێـــك ڕێوی زانی کە بۆبی بووە بە شوانی بەرخەکان، بڕیاری دا، فێڵێکی لێ بکات؛ بۆئەوەی بەرخێك

لەو بەرخانەی کە هاوڕێکەی بۆبی شـــوانییەتی، بخواتو بیکات بە ژەمی ئەو ڕۆژەی!

بۆ ئەم مەبەســـتە ڕۆیشـــت بۆلای بۆبیو پێی گوت: ئایا یاری لەگەڵ مندا دەکەیت؟

بۆبی گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەی بەرخەکان کێ شوانیان بێت؟

ڕێوی هاوڕێی گوتی: ئێمە زۆر دوور ناکەوینەوە، لەم نزیکانە یاری دەکەین.. بۆبی گوتی: زۆرباشە.

ڕێـــوی بە بۆبی هاوڕێـــی گوت: با یاریی چاوشـــارکێ بکەین، کەواتە: تۆ چاوەکانت بنووقێنە، تا من خۆم دەشـــارمەوە.. بۆبی گوتی: زۆرباشە!

لەو کاتەدا ڕۆکی لـــە دوورەوە چاودێریی دەکرد، کاتێك بینی کەوا ڕێوی خۆی گەیاندە ناو بەرخەکان؛ بۆئەوەی بەرخێك ببات لەگـــەڵ خۆیدا، بەپەلە ڕۆکی خۆی گەیانـــدە بۆبیو پێی گوت: چاوەکانت بکەرەوەو سەیری ڕێوی هاوڕێت بکە.. هەردووکیان خۆیان گەیاندە لای بەرخەکان پێش ئەوەی ڕێوی بە مەرامەکەی بگات.. بۆبی ڕووی تێ کردو گوتی: ئەوە چی دەکەیت، دەتەوێت دزی لەو مەڕانە بکەیت، کە من شوانیانم؟!

ڕێوی ســـەیرێکی بۆبی کرد، بەڵام لە شەرمەزاریدا نەیتوانی

یەك وشەش بڵێت.. پاشان بەپەلە ڕۆیشتو خۆی ون كرد.

ئەو كات بۆبـــی زانی، كە چاكەكـــردنو بەوەفابوون لەگەڵ ڕێویدا سروشتی ئەو گیاندارە ناگۆڕێت، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە هەرگیز هاوڕێیەتیی ڕێوی نەكردەوە.

پاشـــان ڕۆكی پێی گوت: هاوڕێ گیان، پێویســـتە هاوڕێی باش هەڵبژێریت؛ چونكە هاوڕێ هاودەمی ڕێگاتە، دەبێت وەكو تۆ بە وەفا بێت، دواتر بۆبی ڕووی كردە ڕۆكیو پێی گوت: زۆر سوپاس بۆ تۆ هاوڕێی ئازیزم، تۆ باشترینو بە وەفادارترین هاوڕێی منیت!

پوختە:

✍ مندالە چاوگەشـــەكان، هیوادارم لـــەم چیرۆكەوە فێر ببن، كە هەرگیز هاوڕێییەتی كەسانێك نەكەن، كە سرووشتی، هاوشـــێوەی سرووشـــتی ڕێوییە! بزانن كێ دەكـــەن بە هاوڕێی خۆتان!

✍ لـــە مێژە گوتویانە: پێم بڵـــێ هاوڕێكەت كێیە، پێت دەڵێم تـــۆ كێیت! چونكە هاوڕێكەت هەڵبژاردەی خۆتە، كەســـانی باش هەمیشە هاوڕێی باش هەڵدەبژێرن، كەسانی خراپیش هاوشێوەی خۆیان هەڵدەبژێرن!



ئیدی هەرگیز سەرپێچی
فەرمانەکانت ناکەم!

سایە منداڵێکی ژیرو هۆشمەندو گوێڕایەڵ بوو، دایكو باوكو كەسوكاری زۆر خۆشیان دەویست؛ چونكە زۆر عاقڵو ڕۆحسووكو زیرەك بوو، هەرگیز سەرپێچی قسەی دایكو باوكی نەدەكرد، ئەوان هەرچیان بگوتایە؛ دەستبەجێ دەیگوت بە چاوان بابەگیان، دایەگیان، هاوكات برایەكی هەبوو ناوی دانا بوو، منداڵێكی سەركەشو بێگوێو هاروهاج بوو، هەمیشە دراوسێكانیان سكاڵایان لە دەستی دەكرد، هەر ڕۆژەو شەڕی لەگەڵ یەكێكیان دەكردو ئازاری دەدان، هیچ كات گوێڕایەڵیی فەرمانی دایكو باوكی نەدەبوو، هەرچەند ئامۆژگارییان دەكرد؛ وەری نەدەگرتو عاقڵ نەدەبوو، دایكو باوكی هەراسان كردبوو، گوێی بە فەرمانو قسەكانیان نەدەدا.

ڕۆژێكیان دایكی داناو سایە، بە نیاز بوو بڕوات بۆ بازاڕ؛ بۆ كڕینی پێداویستییەكانی ناوماڵ ڕووی كردە كوڕو كچەكەیو پێی گوتن: ڕۆڵەكانم من دەڕۆم بۆ بازاڕ، زۆرم پێ ناچێت، دەگەڕێمەوە.. تكایە كەستان لە ماڵ نەچنە دەرەوە؛ تا دەگەڕێمەوە!

سایە گوتی: بەچاوان دایەگیان.. دانا گوتی: بەڵام من دەمەوێت بڕۆم بۆ یاریگا، تا لەگەڵ هاوڕێكانم یاری بكەم!

دایكی گوتی: كوڕی شیرینم، چاوەڕێ بكە، تا دەگەڕێمەوە؛

چونکە تۆ بە تەنها نازانیت بڕۆیت بۆ یاریگا!

پاشان دایکی بەڕێ کەوت بۆ بازاڕ، پاش کەمێك سایە گوێی لە دەنگی کردنەوەی دەرگاکە بوو، بەخێرایی ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە، بینی وا دانای برای تۆپەکەی هەڵگرتووەو لە ماڵ چووەتە دەرەوە.

سایە گوتی: تکایە بگەڕێرەوە، تۆ بە تەنها ڕێگە نازانیت!

دانا وەڵامی دایەوەو گوتی: نەخێر، من شـــارەزای ڕێگە هەم، پێش ئەوەی دایکم لە بازاڕ بگەڕێتەوە، من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ!

ئیدی دانا بەرەو یاریگا بەڕێ کەوت، بەڵام لەبەرئەوەی یاریگا دوور بـــوو لە ماڵیانـــەوە، دوای ئەوەی دوورکەوتـــەوە لە ماڵ، ڕێگاکەی لێ تێکچوو، بەشـــێوەیەك نەدەیزانی بگەڕێتەوە بۆ ماڵ، نە دەیتوانی بڕوات بۆ یاریگا، لەو کاتەدا کوڕێکی قەڵەوی گەورە، لەوسەری گەڕەك دەرکەوت، لێی نزیك بوویەوەو گوتی: بچکۆل ئـــەو تۆپەم پێ بدە.. دانا گوتی: تۆپی خۆمە، خۆ هی تۆ نییە بۆ بیدەم بە تۆ!

کوڕەکەش زللەیەکی لێداو بە زۆر تۆپەکەی لێســـەندو گوتی: بەڵام ئێستا ئەم تۆپە هی منە، نەك تۆ!

دانا دەســـتی کـــرد بە گریانو نەیدەزانی چـــی بکاتو ڕوو لە کوێ بکات، لەبـــەر خۆیەوە دەیگوت: خۆزگە بـــە گوێی دایکمم

بکردبـــاو نەهاتمایەتە دەرەوە! ئێســـتا من چـــۆن بگەڕێمەوە بۆ ماڵ، لەو کاتانەدا دایکی گەڕابوویەوە ماڵو ســـایە پێی گوتبوو، کە دانا ڕۆیشـــتووە بۆ یاریگاو بە قســـەی نەکردووم، دایکیشی بەهەڵەداوانو بەپەرۆشەوە بەڕێ کەوتبوو؛ تا هەواڵی بزانێت، دوای ماندووبوونێکی زۆر، لە کۆڵانێکدا بە دانا دەگاتو دەبینێت دانیشـــتووەو بەکوڵ دەگری، کاتێك چاوی بـــە دایکی دەکەوێت بەڕاکـــردن بەرەو ڕوی دەڕواتو باوەشـــی پێـــدا دەکاتو داوای لێبوردنـــی لێ دەکات! دایکی دەڵێـــت: کوڕم دانا بۆچی لێرەیت، تۆ لێرە چی دەکەیت؟

ئیدی داناش ڕووداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوەو زۆر داوای لێبوردنی لـــێ دەکاتو دەڵێـــت: بەڵێـــن بێت ئیـــدی هەرگیز ســـەرپێچی فەرمانەکانت نەکەم دایەگیان!

پوختە:

✍ ئازیزانم هیـــوادارم چیرۆکی دانا، پەندو ئامۆژگاری بێت بۆ هەموو منداڵە چاوگەشـــەکانو هەرگیز سەرپێچی فەرمانی دایكو باوکیان نەکەن! چونکە ســـەرپێچی فەرمانی دایكو باوك جگە لە زیان، هیچ سوودێکت پێناگەیەنێت!

ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە،
بۆ براکەشت پێتخۆش بێت؟



ئـــارام قوتابییەکی ژیرو زیرەكو لێهاتوو بوو، خۆشەویســـتی مامۆســـتا هاوپۆلەکانی بوو، قوتابییەکی چـــالاكو وریابوو، زۆر حەزی بە نووسینو خوێندنەوە دەکرد..

لەگەڵ ئەوەشدا ئارام کەسێکی خۆپەرستو چاوچنۆك نەبوو، حەزی دەکرد سەرجەم هاوڕێکانی هاوشێوەی خۆی زیرەكو لێهاتوو بن، ڕۆژێك ســـەرنجی یەکێك لە هاوپۆلەکانی دا، کە ناوی ئەمیر بوو، هەستی کرد کە بەردەوام سەیری دەکاتو چاودێری دەکات!

لەبەرئەوە لێی نزیك بووەوەو سلاوی لێکردو لە تەنیشتییەوە دانیشت، ئەمیریش وەڵامی سلاوەکەی دایەوەو بە خۆشحاڵییەوە بەخێرهاتنی کرد.

ئارام وتـــی: کاکە ئەمیـــر ماوەیەکە هەســـتەکەم بەردەوام سەرنجت لەسەر منە! ئایا شتێك ڕوویداوە؟ من شتێکم کردووە تۆی نیگەران کردبێت، یاخود ڕقت لێمە؟

ئەمیـــر وەڵامی دایەوەو وتی: نـــا کاکە ئارام، من هەرگیز ڕقم لە تۆ نەبووە، بەڵکو زۆریش خۆشـــم ئەوێیت، ڕاستییەکەی من دەبینم کە تۆ قوتابییەکی چالاكو گورجوگۆڵو زیرەكو لێهاتوویت، هەمووان خۆشیان دەوێیت ڕێزت دەگرن.. منیش دەمەوێت هەوڵ بدەم وەکو تۆ زیرەكو لێهاتوو بم، بەڵام لە ڕاســـتیدا نازانم چۆن دەست پێ بکەمو دەبێت سەرەتا چی بکەم؟

ئارام بەوپەڕی میهرەبانییەوە دەستی خستە سەرشانی ئەمیرو

پێی گوت: کاکە ئەمیر، هەموو جارێك باوکم ئامۆژگاریم دەکاتو دەڵێــت: بۆئەوەی بگەین بــە ئاواتو خەونەکانمــان، بۆئەوەی بتوانین ببینە کەسـێکی بە ئەزموونو لێهاتوو، دەبێت ســەرەتا ئامانجەکەمان دیاری بکەین! ئێستا تۆ دەتوانیت پێم بڵێی ئامانجت چییەو دەتەوێت ببیت بەچی؟

ئەمیر وتی: کاکە ئارام لە ڕاستیدا نازانم دەمەوێت ببم بەچی! ڕەنگە ئەندازیار، یان مامۆستا!

ئــارام وتــی: کاکە ئەمیــر ســەرەتا دەبێت فێربیــت، چۆن ئامانجەکانت دیاری دەکەیت، پاشــان ئــەو ڕێگایانە کامانەن کە دەتگەیەنن بە ئامانجەکانت؟

بــۆ نمونە، وێنــەی ئامانجەکەت بکێشــە، پلانی بــۆ دابنێ، بینووسەرەوە، قسەی لەبارەوە بکە..

ئیدی لێرەوە دەزانیت کاتێــك ئامانجەکەت دیاری کرد، ئەو کات پلانی گەیشــتن بە ئامانجەکــەت دادەنێی! ئــارامو ئەمیر پێکەوە دانیشــتن، پلانیــان دانا، ئارام بە ئەمیــری وت: لەمڕۆ بەدواوە تۆ دەبێت بەیانیان زوو لە خەو هەڵســیت، دەســتنوێژ بگرەو نوێژی بەیانی ئەنجــام بدە، هەرگیز لەبیری نەکەیــت هەموو بەیانییەك ددانەکانت بە جوانی بشۆرە، نانی بەیانیان فەرامۆش مەکە، چونکە ئەوە زۆر گرنگە تا ڕۆژێکی چالاك ببەیتەسەر، پێویستە نانی بەیانی بخۆیت، ڕۆژانە زوو بڕۆ بۆ قوتابخانەو دوامەکەوە، بە جوانی گوێ

بۆ مامۆستا بگرە، ئەگەر لە شتێك تێنەگەیشتی پرسیار بکە!

ئەمیـــرو ئارام لەســـەر ئەم پلانە ڕێککەوتـــن، ڕۆژانە ئەمیر گوێـــی بۆ ئامۆژگارییەکانی هاوڕێکەی ئـــارام دەگرتو گوێڕایەڵی دەکرد، ئەوان بوونـــە دوو هاوڕێی زۆر نزیکی یەکتری! هاوکات خێزانی ئەمیر زۆر دڵخـــۆش بوون بەو گۆڕانکارییە گەورەی لە کوڕەکەیاندا بەدی هاتبوو!

ڕۆژێکیان ئەمیر بە ئارامی هاوڕێی گوت: هەموو ئەو شتانەی تۆ پێت وتوم، جێبەجیم کردووە، هاوکات یارمەتی هاوڕێکانیشـــم ئەدەم، هەروەکو چۆن تۆ یارمەتی منت یاوە..

بەڵام من ئەکرێت پرسیارێك بکەم؟

ئارام فەرموو براکەم.. ئەمیر: بۆچی لەبەرخاتری من ئەوەندە خۆت ماندوو کردووە، بۆ ئەوەندە هاوکاری من دەکەیت؟

ئـــارام وتی: چونکـــە باپیرم پێی وتم: کە پێشـــەوامان درودی خوای لەسەربێت، فەرموویەتی: ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە، بۆ براکەشت پێت خۆش بێت!

پوختە:

مندالـــە چاوگەشـــەکان ئێـــوەش دوای خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە، ئامانجەکانی خۆتان دیاری بکەنو بینوســـنەوەو پلانی گەیشتن بە خەونەکانتان دابڕێژن، هەروەها بەردەوام هاوکارو یارمەتیدەری ئەو کەسانەش بن کە پێویستیان پێتانە!

سـومەییە کچێکی ئازاو بوێرو بە هەڵوێسـت بوو، هەمیشە حـەزی بـە یارمەتیدانو سەرخسـتنی سـتەملێکراو دەکردو دژایەتی کەسـانی سـتەمکاری دەکرد، هەموو کات بەرگری لە کەسانی بچووك، لاوازو بێ دەسـەڵات دەکرد، ستەمکاری خۆش نەدەویسـتو دژی ستەمو چەوسـانەوە بوو، تەنانەت ئەگەر بیبینیایە منداڵێك ئازاری سەگێك، یان پشیلەیەك، یان باڵندەیەك دەدات، ڕێگەی لێدەگرتو پێی دەگوت: ئەوە ئاژەڵێکی بەسەزمانە تۆ مافت نییە ئازاری بدەیت!

ڕۆژێك سـومەییە دەڕۆیشـت بۆ قوتابخانە، لە ڕێگەدا دوو کچە خوێندکاری بینی کە لە خۆی زۆر گەورەتربوون، کچەکان هەوڵیان دا ئەو مەدالیایەی لێ بسـەنن کە براکەی پێشکەشی کردبوو، بە هۆی دەرچوونی بە پلەی یەکەم لە قوتابخانە!

هەرچەنـدە هەوڵیدا قسـەیان لەگەڵدا بکات، بەڵام بێ سـود بوو، سـومەییە کەمێك لێیان ترسا، سـومەییە یەکەم جاری بوو، ڕووبەڕووی ترس ببێتەوە، کچەکان پێیان وت: بەخۆشی خۆت ئەو مەدالیایەمان بدەرێ، ئەگینا لێت ئەدەینو بە زۆر لێت ئەسەنین، سومەیە بە ناچاری مەدالیاکەی پێدان، پاشان ملی ڕێگەی گرتەبەر تا گەیشـتە قوتابخانە، هاوڕێکەی کە هەسـتی کرد، سـومەییە بێتاقەتە، پرسی: شتێك ڕوویداوە سومەییە خانم؟ سومەییە وەڵامی دایەوە: نەخێر هیچ شتێکی ئەو تۆ نەبووە شایەنی باس بێت!

بۆ ڕۆژی دواتر سومەییە ڕۆیشت بۆ قوتابخانە، دووبارە تووشی چەنـد خوێندکارێك بـووەوە، پێیان وت: ئەو ئەنگوسـتیلەیە دەستت زۆر جوانە، دەمانەوێت بیدەیت بە ئێمە!

سومەییە وتی: چۆن بیدەمە ئێوە لە کاتێکدا هی خۆمە؟

کچەکان بەگاڵتەجاڕییەوە دەسـتیان کـردە قاقای پێکەنین‌و وتیان: ئێستا هی تۆیە، بەڵام پاش کەمێکی تر دەبێت بە هی ئێمە!

سومەییە بەوپەڕی خێراییو بە گریانەوە ڕای کرد لە دەستیان‌و بەرەو قوتابخانە هەڵهات!

کاتێك نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بێتاقەت‌و خەمبار بوو، هۆن هۆن ئەسـرینی هەڵدەوەراند، خوشـکە گەورەکەی لێی پرسی: سومەییە چی ڕوویداوە، بۆچی دەگریت؟

سـومەییەش تەواوی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، خوشکەکەی وتی: سـومەییە ئەی ئازایەتییەکەت لە کوێیە؟ خۆ تۆ بەردەوام باسی ئازایەتیت دەکردو کچێکی ئازا بوویت..

سـومەییە وتی: ئـەوان زۆر لە من گەورەتـرو بەهێزترن، لەبەرئەوە من لێیان دەترسم‌و ناتوانم ڕووبەڕوویان ببمەوە!

خوشـکەکەی وتی: هیچ مەترسە، پێویسـت بە ترس ناکات، پێویسـتە تۆ ئازا بیت! سـومەییە وتی: من چۆن دەتوانم ئازابم لەگەڵ ئەواندا، کە ئەوان لە من گەورەترو بەهێزترن!

خوشـکەکەی پێی وت: ئازایەتی زۆر جار باسك‌و بازوو نییە،

بەڵکو چۆنییەتی ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێستەکانە، ئێستا پێویستە تۆ بەڕێوەبەرو مامۆستاکانت ئاگادار بکەیتەوە!

بۆ ڕۆژی دواتر سومەییە ڕۆیشت بۆ قوتابخانە، لەگەڵ هاوڕێکەی پلانێکی بەهێزیان دانا، سەرەتا ڕۆیشتن بۆ لای بەڕێوەبەرەو مامۆستاکەیان، بابەتەکەیان بۆ ڕوونکردنەوە، پاشان بەپێی پلانێك ڕۆیشتن بۆ شوێنی ئاوخواردنەوەکە، لەوێ تووشی کچەکان بوونەوە،کچەکان چوونە بەردەمی‌و پێیان وت: دوێنێ لە دەستمان ڕاتکرد، ئەی ئەمڕۆ چی دەکەیتو بۆ کوێ دەڕۆیت؟

سومەییە ئازایانە پێی گوتن: چیتان دەوێت؟

کچەکان وتیان: ئەو ئەنگوستیلە جوانەمان دەوێت! لەو کاتەدا جەنابی بەڕێوەبەر لە پشتیانەوە دەرکەوتو پێی گوتن: تەشریف بهێنن بۆ ژووری بەڕێوەبەر، تا سزای ئەم کارەتان وەرگرن! سومەییە زۆر دڵخۆش بوو، بەوەی پلانەکەی سەری گرت، دووبارە هەستی ئازایەتی لە ناخیدا زیندوو بووەوە!

پوختە: منداڵە چاوگەشەکان، مەرج نییە، تۆ بە باسکو بازوو ئازابیت، چونکە ئەگەر پەنات بۆ باسکو بازو برد، دڵنیابە هەمیشە کەسانێك هەن لە تۆ باسکو بازوویان بەهێزترە، کەواتە هەمیشە عەقڵت بەهێز بکەو پلانی عەقڵ لە پلانی باسکو بازوو بەهێزترە!

# حەزئەکەم بە سەربەستی بژیم!



نـــور کچێکی ژیرو عاقـــڵو زیرەك بوو، هەر لــــە منداڵییەوە دایکی فێری یاســـاو پاكوخاوێنیو ڕێکخســـتنی کەلوپەلەکانی کردبوو، بەردەوام هاوکاری دایکی بوو، لە ڕێکخســـتنی ناوماڵو خاوێنکردنەوەی ماڵەکەیاندا، حەزی بە پاكو خاوێنیو ڕێكوپێکی ماڵو ڕازاندنەوەی کەلوپەلەکان دەکرد.

ڕۆژێکیـــان نور مۆڵەتی لــــە دایکی وەرگرت بۆئەوەی ســـەردانی هاوپۆلێکی بکات، کە ماڵیان لە هەمان کۆڵانی ماڵی خۆیان بوو، کاتێك چـــووە ژووری کچە هاوڕێکەی، بینی ژوورەکـــەی زۆر نارێکە، هیچ شتێك لە شوێنی خۆی نییە، کەلوپەلو جلوبەرگەکانی بە تەواوی ژوورەکەیـــدا پەرشوبڵاوە، کاتێك پرســـیاری لێکـــرد لە هۆکاری ئەم نارێکییـــە، هاوڕێکەی وتی: من حەزم لە یاســـاو کـــۆتو بەند نییە، تاقەتی ڕێکخستنو پاککردنەوەی ژوورم نییە، حەزم لە سەربەستییە لە هەر کوێ گەیشتم جلوبەرگـو کەلوپەلەکانم دادەنێم..

نوریش وتـــی: منیش حەزم دەکرد وەکو تۆ سەربەســـتانە ژیانم بگوزەراندایە! کاتێك نور گەڕایەوە ماڵەوە، جلوبەرگەکانی گۆڕیو فڕێی دایە سەر جێگەی نووستنەکەی، کاتی نانخواردنی نیوەڕۆبوو، دایکی چووە ژوورەکەی تا بانگهێشتی بکات بۆ چێشتخانەو پێکەوە نانی نیوەڕۆ بخۆن، بەڵام کاتێك ژوورەکەی چاوپێکەوت سەرســـام بـــوو، بینی وا نـــور جلوبەرگەکـــەی فڕێ داوەتە ســـەر جێگەی

نووستنەکەیو کەلوپەلەکانی بەم لاولادا پەرشو بلاوکردووە، بە سەرسوڕمانەوە پرسی: نور لێرە چی ڕوودەدات؟

نـــور وتی: دایە حـــەز دەکەم بە سەربەســـتی بژیم، لە هەر شوێنێك پێم خۆشبێت کەلوپەلەکانم دابنێم، تاقەتی یاساو ڕێساو کۆتو بەندم نییە!

دایکی کە ئافرەتێکی ڕۆشـــنبیرو تێگەیشتوو بوو، وتی: باشە کچی شیرینم هەرچۆنێك پێتخۆشە ئاوا بکە.

بەڵام دڵنیابە ئەوە سەربەستی نییە!

نور بە قســـەکانی دایکی زۆر دڵخۆشبوو، کە ڕێگەی دا چۆنی پێخۆش بێت ئاوا بـــژی، ئیدی پێڵاوەکانی لەســـەر پلیکانەکانو کتێبەکانی لەم لاو جلوبەرگەکانی بەسوچو قوژبنی ژوورەکەدا بلاودەکردەوە، ئەو شەوە نور زۆر بە دڵخۆشی خەوت، وایدەزانی گەیشتووە بە سەربەستی ژیان، بۆ ڕۆژی دواتر کاتێك هەستا لە خەو تا خۆی ئامادە بکاتو بڕوات بۆ قوتابخانە، لە جلوبەرگەکانی دەگەڕا تا بزانێت لە کوێ دایناوە، لە لایەك بە دوای کتێبەکانیدا دەگەڕا تابزانێت کەوتۆتە کام ســـوچی ژوورەکەی، کە جلەکانی دۆزییەوە ســـەیری کرد چرچو لۆچ بوون پێویســـتیان بە ئوتوە ئەی ئوتووەکە لە کوێیە، کاتێك ئوتوەکەی دۆزییەوە بینی شکاوە چونکە ڕۆژی پێشـــتر فڕێی دابووە ســـەر مێزەکـــەو کەوتبووە

خوارەوەو شـــكابوو، هەرچی دەكرد ئامـــادە نەدەبوو تا بڕوات بۆ قوتابخانە، كاتیش بەرەو درەنگی دەچوو، كەمێك دانیشتو بیری كردەوە دەبێت چی بكات؟

خەیاڵی قســـەكانی دایكی كردەوە كە پێـــی گوت: كچی خۆم ئەمە سەربەســـتی نییە!ناچار ڕۆیشـــت بۆ لای دایكی میهرەبانیو پێی گوت: دایەگیان بمبورە من هەڵە بووم، دایكی باوەشی پێداكردو وتـــی: من دەمزانی تۆ كچێكی ژیرییو ناتوانیت ئەو ژیانە فەوزاویو جنجاڵییە قبوڵ بكەیت.. كچە شـــیرینەكەم، سەربەستی ئەوەیە كە تـــۆ گرنگی بە یاســـاو ڕێســـاو پاكوخاوێنیو ڕێكخســـتنی كەلوپەلەكانت بدەیتو بە ئاسوودەیی ژیان بگوزەرێنیت..

نـــور: زۆر سوپاســـی دایكی كـــرد بەڵێنی پێدا، كـــە هەرگیز فەرامۆشی نەكاتو وەكو جاران گرنگی بە ڕێكخستنی كەلوپەلو پاكوخاوێنیو ئیدارەی ماڵو ژوورەكەی بدات..

پوختە:

- منداڵـــە چاوگەشـــەكان ئەگەر ســـەردانی هاوڕێكەت كرد، چاو لە شـــتە خراپەكانی مەكە، چاو لە ســـیفەتە جوانو باشەكانی بكە..
- دڵنیابە دایكو باوكت دڵســـۆزترین كەســـی تۆن، تكایە هەرگیز ئامۆژگارییەكانیان فەرامۆش مەكە!

لە دێر زەماندا لە گوندێکی بچکۆلانەدا، خەڵکێکی سادەو هەژارو کەم دەرامەت دەژیـــان، لەو گوندەدا دوو برا هەبوون، یەکەمیان نـــاوی (هێمن) بوو، هەژارو کەم دەســـەڵات بوو، بەڵام چاکەکارو ڕەوشـــتبەرز بوو، لەگـــەڵ دەوروبەرو دراوســـێکانیدا مامەڵەی جوانو ڕەفتار شـــیرین بـــوو، حەزی بە هـــاوکاریو یارمەتیدانی خەڵکی دەکردو هەرچی لە دەست بهاتایە دریٖغی نەدەکرد، هاوکات لەگەڵ خێزانو منالەکانیدا ژیانیان زۆر خۆشو ئاسوودە بوو.

دووەمیـــان ناوی: ئاســـۆ بوو، کەســـێکی دەوڵەمەندو خاوەن سامان بوو، لە نێوماڵێکی گەورەو خۆشدا دەژیا، بەڵام کەسێکی خۆشەویســـتو لەبـــەردڵان نەبـــوو، چونکە چـــروكو ڕەزیل بوو، یارمەتی کەســـی نەدەدا، بەمشـــێوەیە ئـــەم دووبرایە یەك دەوڵەمەندو ئەوی دی هەژار ژیانیان دەگوزەراند.

ڕۆژان دەهـــاتو دەڕۆیشـــت، ئێوارەیـــەك هێمن بـــەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، کاتێك گەیشتە ماڵ، چاوی بە خێزانەکەی کەوت، بینی زۆر خەمبارە، دەســـتەوئەژنۆ دانیشـــتووە، کاتێك پرسیاری لێکرد: بۆچی وا خەمباری؟

وتی: نانی نیوەڕۆمان نەخواردووە، هیچ پارەیکیشم پێ نەبوو تا خواردنێك بۆ ئێوارە بکڕم، منداڵەکانیشـــم برسیانە! پێویستە بیر لە ڕێگە چارەیەك بکەینەوە!

به بیستنی ئەم هەواڵە هێمن زۆر نیگەران بوو، ئەو ڕۆژەش کاری دەست نەکەوتبوو، تەنها بڕێکی کەمی دەست کەوتبوو، لە کاتی گەڕانەوەیدا هەژارێکی بینیبوو، ئەوەشـــی بەخشیبوو بەو هەژارە، نەیزانیبوو، خێزانو منداڵەکانی هیچ پارەیەکیشـــیان پێ نییەو هەروەها نانی نیوەڕۆشیان نەخواردووە.

پاشـــان هێمن بیری لە ڕێگە چارەیەك کردەوە، تا منداڵەکانی لە برسێتی ڕزگار بکات، بۆ ئەم مەبەستە بڕیاری دا بڕوات بۆ لای ئاسۆی برایو داوای کۆمەكو یارمەتی لێ بکات، لە ماڵ هاتەدەرو بەرەو ماڵی ئاســـۆ ملی ڕێگەی گرتەبەر، کاتێك بەسەرهاتی ئەو ڕۆژەی خۆیو منداڵەکانی بۆ ئاســـۆی برای گێڕایەوە، ئاسۆ لە مەبەستی سەردانی براکەی تێگەیشـــت، پێی گوت: تۆ ماڵو سامانی خۆت دەبەخشیتو پاشـــان دێیت بۆ لای مـــنو داوای یارمەتی دەکەیت؟ هێمن باش گوێ بگرە، ئەمجارە هەندێك خۆراكو پێداویستیت پێ دەدەم، بەڵام هاوار بۆ تۆ ئەگەر جارێکی تر بێیتو داوای یارمەتی لە من بکەیت!

هێمن بەناچـــاری خواردنەکەی وەرگـــرتو زۆر بەخەمباری بەرەو ماڵ گەڕایەوە، لەبەرخۆیـــەوە دەیگوت: خودا لێت خۆش بێت براکەم!

لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ ماڵ، پیاوێکی نورانی جوان ڕووخساری پێگەیشت، وتی: سڵاو کوڕی شیرینم، ئەوە چییە بەدەستەوە؟

هێمنی بەخشندەو دڵگەورەو میهرەبان، زۆر بە گەرمی وەڵامی سـڵاوەکەی دایەوەو وتی: مامە گیان ئـەوە هەندێك خواردنە..

مامەپیرە پرسی: کوڕم بۆ کوێ دەڕۆیت؟

هێمن: چیرۆکەکەی بۆ مامەپیرە گێڕایەوەو پاشان خواردنەکەی کـردە دوو بەشو وتی: مامەگیان ئـەم خواردنە زۆرە نیوەی بۆ تۆو نیوەی بۆ ئێمە!

مامەپیرە پێی گوت: کوڕی خۆم کارت چییە؟

هێمن وتی: مامەگیان من چێشتلێنەر بووم لە ماڵی یەکێك لە دەوڵەمەندەکان، بەڵام ئێستا ئەو دەوڵەمەندە سەفەری کردووەو ئەم شارەی جێهێشتووە، لە ئێستادا هیچ کارێکم نییە!

مامەپیـرە زەردەخەنەیەکـی کـردو وتی: مادەم تـۆ ئەوەندە بەخشندەو ڕەوشتبەرزو ئاکار جوانی، دڵنیابە خودا تۆ لە یاد ناکات، فەرموو بەشە خواردنەکەی خۆت بگرەو بیبەرەوە بۆ منداڵەکانت، سبەینێ کە لە خەو هەڵسایت بڕۆ بۆ کۆشکی حەسان پاشا، ئەو لە مێژە بە دوای چێشتلێنەرێکی لێهاتوودا دەگەڕێت!

هێمن زۆر سوپاسی مامەپیرەی کردو خواحافیزی لێکردو بەرەو ماڵ گەڕایەوە، بە دەم نانخواردنەوە بەسـەرهاتەکەی بۆ خێزانو منداڵەکان گێڕایەوە، بۆ سبەی هێمن زوو لە خەو هەڵساو بەرەو شـار بۆ کۆشکی حەسـان پاشـا، بەڕێکەوت.. لەو ڕۆژەوە بووە

چێشتلێنەری حەسان پاشاو لە کۆشکدا ژیانی گوزەراند، حەسان پاشـــا زۆر حەزی بە چێشتو خواردنەکانی دەستی هێمن دەکرد، لەبەرئەوە کردییە چێشـــتلێنەری تایبەتی خۆی، پاشـــان فەرمانی کرد کە خانوویەکی گەورەو زۆر خۆشـــی لە تەنیشتی کۆشکەوە بۆ دروست بکەن، تا خۆیو منداڵەکانی لەو خانووەدا نیشتەجێبن، لەبەرئـــەوەی دەیزانی هێمن کەســـێکی دڵســـۆزو دەســـتپاکو بە ئەزموونە، هەژارانی خۆشـــدەوێتو هەمیشـــە حـــەزدەکات کە دەستگیرۆییو یارمەتیدەرو هاوکارییان بێت، هەر کات ڕۆزییەك یا هەر شتێکی دەست بکەوتایە، دابەشی دەکرد بەسەر هەژاراندا..

پوختە:

✍منداڵە چاوگەشـــەکان، بە وردی ســـەرنج بـــدەن، ئاکامی ئەوەی کە هێمن گەیشـــتە کۆشکی پادشـــاو بووە چێشتلێنەری پادشـــاو بووە خاوەنی خانوویەکی خۆشو گەورە لە تەنیشـــت کۆشکی پادشاوە دەزانن چی بوو؟

✍ بێگومان بەخشـــندەییو خۆنەویســـتیو خۆشویستنی هەژارنو دڵســـۆزی لە کاردا بوو! هیـــوادارم ئێمەش هەموومان بتوانین ئەم ســـیفەتە جوانانە لە ناخماندا بڕوێنینو کاریان پێ بکەین!

بەیانییەکی ســاردو ســەرما، بەفر چیاکانو دەشتوهەردی ســپی پۆش کردبوو، بایەکی ســارد هەڵی کردبــوو، وەخت بوو لــە ســەرمان ڕەق هەڵێین، لەو بارودۆخەدا پاســەکە هات بە شــوێنمداو ڕۆیشــتم بۆ قوتابخانــە، یەك یــەك هاوپۆلەکانمی کۆکردەوە، جیاواز لە ڕۆژانی دی، کەس لە سەرما تاقەتی قسەو سوعبەتو پێکەنینی نەبوو، سەرما تەنگی بە هەمووان هەڵچنی بوو، پاســەکە زۆر هێــواش ڕێگەی تەی دەکرد، تا گەیشــتینە قوتابخانــە، جەنابــی بەڕێوەبەر وەك پیشــەی هەمیشــەیی بۆ پێشــوازی قوتابیان لەدەروازەی سەرەکی ڕاوەستابوو، بەڵام ئەو بەیانییە بۆ بەخێرهاتنو پێشــوازی نا، لەبری ئەوە فەرمانی بە شۆفێری پاســەکان کرد، کە خوێندکارەکان دانەبەزێنن، چونکە دونیا زۆر ســاردەو قوتابییەکان بەرگەی ئەو سەرمایە ناگرن، بیان بەرەوە بۆ ماڵەوە، با سەرمایان نەبێتو نەخۆش نەکەون!

کاتێك گەڕامەوە ماڵ، دایکم بینی لەسەرما سور هەڵگەڕاوەو دەموچــاوم ســووربۆتەوە، بــە خێرایــی ســپلێتی ژوورەکەی داگیرساندو هیتەرەکەشی هەڵکرد تا گەرمم بێتەوە، بەڵام هێشتا بە تەواوی گەرمم نەهاتبووەوە، لەنــاکاو کارەبا بڕا، دایکم زۆر خەریك بوو، تا چاکی بکاتەوە، وایزانی تەنها ماڵی ئێمەیە، بەڵام

دواتر دەرکەوت کە کارەبای نیشتمانی بە تەواوی پەکی کەوتووە بە هۆی بەفرو بارانەوە..

ئیدی دایکم ویستی سۆپاکە داگیرسێنێت تا کەمێك گەرممان بێتەوە، ماندوو بوو تا توانی سۆپایەك داگیرسێنێت، دیاربوو نەوتی خراپ پلێتەی سۆپاکەی ڕەق کردبوو!

ئەو ڕۆژە دایکم نەیتوانی غەسالەکەش داگیرسێنێت تا جلەکانمان بۆ وشك بکاتەوە، هەمووان بە بێتاقەتی بە دەوری سۆپاکەدا دانیشتبووین، تەنانەت نەمان دەتوانی سەیری تەلەفزیۆنیش بکەین، هەروەها نەمان دەتوانی کۆمپیوتەرەکەشمان داگیرسێنین، چونکە کارەبا نەبوو، بە دایکمم وت: باشە چیمان دەکرد ئەگەر کارەبا نەبووایە؟ ژیان چەند نارەحەت دەبوو؟

دایکم وتی: کارەبا نیعمەتێکی گەورەیە، هاوشێوەی خۆراكو ئاو ، ئەگەر کارەبا نەبووایە، ئەوا ژیان زۆر سەخت دەبوو، هیچ ئامێرێکی کارەبا کاری نەدەکرد، ئەو کات دەبوا هەوڵێکی زۆرمان بدایەو خۆمان زۆر ماندو بکردایە تا خۆمان گەرم بکەینەوەو جلوبەرگەکانمان بشۆرینو ڕووناکییەکمان دابین بکردایە تا لە تاریکی شەودا لەبەری دابنیشین، هاوکات نە تەلەفزیۆنو نە کۆمپیوتەرو نە ڕادیۆو نە تەسجیلو نە مۆبایلو نەهیچ ئامێرێك

دەبوو، کە پێویستی بە کارەبا بێت. بیهێنە پێش چاوی خۆت ژیان بێ ئەم ئامێرانە چەند سەخت دەبوو!

وتم: زۆر ڕاستە دایە گیان، بەڕاستی تا ئەمڕۆ نەمزانیبوو کارەبا ئەوەندە نیعمەتێکی گەورەیە، کەواتە زۆر پێویستە پارێزگاری لێ بکەین و زیادەڕەویی لەبەکارهێنانیدا نەکەین!

ئەو ڕۆژەمان بێ کارەبا بەسەر برد، ڕۆژێکی ساردو ناخۆش بوو، بە مانگێك لێمان ڕۆیشت، ئێوارە داهات، لەناکاو کارەبا هاتەوە، ماڵ بە جارێك ڕووناك بووەوە، تەلەفزیۆن داگیرسا، غەسالە کەوتەوە کار، کۆمپیوتەرو خەتی ئینتەرنێت کەوتەوە کار، سپلێت ژوورەکەی بە تەواوی گەرم کرد، لە خۆشیدا نەماندەزانی چی بەین! هەموان سوپاسی خودامان کرد لەسەر ئەو نیعمەتە بەرزە!

پوختە:

ئازیزانم هەروەکو ناتوانین، بەبێ ئاوو خۆراك بژین، هەروا ژیانیش بێ کارەبا زۆر سەختە، کەواتە لە ئێستاوە با ئاگاداربین، زیادەڕەویی لە بەکارهێنانی کارەبادا نەکەین، گڵۆپی زۆر دانەگیرسێنین، ئەگەر لە ژوورەکانمان هاتینەدەرەوە سەرجەم ئامێرە کارەباییەکان خامۆش بکەین! بۆئەوەی ئەم نیعمەتە جوانەمان بۆ بەردەوام بێت!

له دێرزەماندا لاوێكی هەژارو بێكارو كەمدەرامەت لە گوندێكی دوورەدەست دەژیا، ئەم لاوە بۆ گەڕان بە دوای كارێكدا، هاتە نێو شـــار، زۆر گەڕا، ماندووبوو لە گەڕان، ڕۆژێك نا، دووان، سیان، ... هتد، بەڵام كارێكی دەست نەكەوت..

چەنـــد ڕۆژێك تێپـــەڕی، ڕۆژێكیان لە كاتـــی گەڕانەوەیدا بۆ ماڵ، پێیەكانی هەڵخلیســـكاو كەوتە ســـەر زەوی، كە ویســـتی هەستێتەوە، گوڵێكی زۆرجوانی بەدی كرد، گوڵەكە لەوە دەچوو تازە كەوتبێتە ســـەر زەوی، تازە بوو، نەشـــەمزابوو، گوڵەكەی هەڵگرتەوەو كەوتەوە سەر ڕێ بەرەو ماڵ..

لـــە ڕێگەدا گەیشـــت بە پیاوێـــك، منداڵێكـــی بچكۆلانەی بە باوەشـــەوە بوو، منداڵەكە ئاماژەی بۆ گوڵەكەی دەســـتی لاوەكە كـــردو بە باوكی گـــوت: كە ئەو گوڵە جوانـــەم دەوێت.. باوكی كـــە نەیدەزانی چۆن داواكاریـــی منداڵەكە بە لاوەكە بڵێت، لەو كاتەدا لاوەكە كە هەســـتی كرد، منداڵەكە ئەو گوڵەی دەوێت.. گوڵەكەی پێشكەشـــی منداڵەكە كرد، ئەوانیش زۆر سوپاســـیان كردو دەبەیەك ئاوی خواردنەوەیان پێبەخشی.

لاوەكە لە ڕێگە بەردەوام بوو، دووبارە گەیشت بە پیاوێك كە دیـــار بوو، زۆر ماندوو تینوو بوو، گەرما بڕســـتی لێ بڕیبوو، لە

ڕێبوار دەچوو، دیاربوو لە ڕێیەکی دوورەوە هاتبوو، لاوەکە دەبە ئاوەکەی بەخشی بەم ڕێبوارە ماندووەکە!

ڕێبوارەکە ئاوەکەی خواردەوەو تینویتی شـــکا، زۆر سوپاســـی لاوەکـــەی کـــرد، لە پاداشـــتی ئـــەو چاکەیەی دەســـتی کرد بە جانتاکەیداو ملوانکەیەکی دەرهێنا، لاوەکە زۆر بە لایەوە جوان بوو، بەسەرسوڕمانەوە گوتی: ئەوە چییە؟

ڕێبوارەکەش گوتی: ئەم ملوانکەیە هی کچی پادشایە، لێی کەوتووە، مـــن ناتوانم بـــۆی ببەمەوە، بەڵام تـــۆ دەتوانی ئـــەم ملوانکەیەی بۆ ببەیتەوە، شازادە ئەم ملوانکەیەی زۆر لا بەنرخە، ناوی شازادە لەسەر ملوانکەکە نووســـراوە، لاوەکەش زۆر بەخۆشحاڵییەوە ملوانکەکەی وەرگرتو بۆ یەکەمجار ملی ڕێگەی بەرەو کۆشکی پادشا گرتەبەر، سڵاوی لە پاســـەوانەکان کردو مۆڵەتی خواست بۆ بینینی شازادە.. ئەوانیش کە زانییان ملوانکەکەی شـــازادەی هێناوەتەوە، ڕێگەیان دا بچێتە لای شازادە.. لاوەکە ملوانکەکەی پێشکەشی شازادە کرد!

شازادە بە بینینی ملوانکەکەی زۆر دڵخۆشبوو، بەسەرسامییەوە پرسی: تۆ ئەم ملوانکەیەی منت لە کوێ دۆزیوەتەوە؟!

لاوەکە چیرۆکی دەســـتکەوتنی ملوانکەکەی لە سەرەتاوە بۆ گێڕایەوە!

شازادە زۆر سوپاسی کردو گوتی: لەبەرامبەر ئەم دەستپاکییەتدا چیت پێویستە داوا بکە، تا پێت ببەخشم!

لاوەکەش گوتی: بۆئەوەی بە دەستپاکی بمێنمەوە پێویستم بە کارێکە؛ چونکە من هیچ کارم نییەو چەند ڕۆژێکە بەدوای کاردا دەگەڕێم!

شازادەش گوتی: لەمڕۆ بەدواوە، تۆ لە نێو ئەم کۆشکەدا کار بکەو مانگانە مووچەی خۆت وەربگرە! لاوەکەش لە خۆشیدا نەیدەزانی بگری، یان پێ بکەنێت، دەستی کرد بە کارکردنو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر زیرەکیو لێهاتوویيو دەستپاکی خۆی دەسەلماند..

پوختە:

✍ منداڵە چاوگەشەکان، دەزانن لاوەکە چۆن توانی بگاتە نێو کۆشکو لەوێدا پەرە بە دەستپاکیو زیرەکیو لێهاتووییەکانی خۆی بدات؟ بێگومان لە ڕێگەی بەخشینەوە بوو، کەواتە تۆش ببەخشەو دڵنیابە هەر لە دنیا پاداشتەکەی وەردەگریت!

✍ بەخشینی گوڵێك، ئەم لاوەی گەیاندە کۆشکی پادشا، کەواتە تۆش هیچ کات، هیچ شتێك بە کەم مەزانە، بەخشین گەورەیە ئەگەر خەندەیەکیش بێت!

ئـــارام لە قوتابخانە دەگەڕایەوە، لە ڕێگەدا فرۆشـــیارێکی بینی، منـــدالآن لە دەوری کۆ بووبوونەوە، ئارام هەڵوێســـتەیەکی کرد، تا بزانێت بۆچی مندالآن کۆبوونەتەوەو ئەو فرۆشیارە چی دەفرۆشێت؟

بینی فرۆشـــیارەکە جووجەڵە دەفرۆشێت، کە هەر یەکەیان ڕەنگێکی ســـەرنجڕاکێش بوون، ئارام بـــە دیتنی جووجەڵەکان زۆردڵخـــۆش بوو، جووجەڵەیەکی بچووکی کڕیو بە دڵخۆشـــی بەرەو ماڵ گەڕایەوە، جووجەڵەکەی لە ئامێز گرتبوو، قســـەی لەگـــەڵ دەکردو دەیگـــوت: منو تۆ پێکـــەوە دەبینە هاوڕێ، من لەمەودوا زۆر گرنگی بە تۆ دەدەم، پێکەوە یاری دەکەین!

کاتێك گەڕایـــەوە ماڵەوە، دایکی بەخێرهاتنـــەوەی کردو بە خەندەوە گوتی: ئەم میوانە بچووکەمان کێیە؟

ئارام گوتی: دایەگیان، ئەوە هاوڕێ تازەکەمە، دەســـتیان کردە پێکەنینو بەخێرهاتنی میوانە تازەکەیان کرد!

ئـــارام لەو ڕۆژە بـــەدواوە، هەوڵی دەدا کـــە گرنگی زۆر بە هاوڕێکەی بدات، یاری لەگەڵدا دەکردو دانەوێڵەو خواردنو ئاوی بۆ دادەنا، لەگەڵ ئەوەشدا ئارام هەستی دەکرد کە جووجەڵەکەی زۆر بێتاقەتە، بەباشی خواردن ناخوات!

ڕۆژەکان تێپەڕین، جووجەڵە بـــەردەوام لاوازو بێتاقەت بوو، ئارام

نەیدەزانـــی چی ڕوو دەدا، لەگـــەڵ ئەو هەموو خزمەتەشـــدا، بۆچی جووجەڵەکەی هەمیشە بەرەو لاوازی دەچێت؟

ناچار ڕۆیشـــت بـــۆ لای دایکیو بارودۆخـــی جووجەڵەکەی پێ ڕاگەیاند، دایکی کەمێك بیری کردەوەو دواتر گوتی: کوڕی شیرینم، خۆت بخەرە شوێنی جووجەڵەکەو بیر بکەرەوە، بۆچی خەمباریت؟!

ئـــارام گوتی: لەوانەیە منی خـــۆش نەوێت، لەوانەیە ڕقی لە مـــن بێت، بەڵام بـــە هیچ کام لەم وەڵامانەی خـــۆی ڕازی نەبوو، لەبەرئـــەوە جارێکی دیکـــە گەڕایەوە بۆ لای دایکـــیو دووبارە پرسیاری لێکرد..

دایکی گوتی: کوڕی شـــیرینم، ڕات چییە ئەگەر تۆ بە تەنها لە ژوورەکەت دابنیشیتو نەڕۆیت بۆ قوتابخانە، سەردانی هیچ کام لە هاوڕێکانت نەکەیت، کەســـیش ســـەردانی تۆ نەکات، نەچیتە دەرەوەی ماڵ، ئایا لەو کاتەدا هەست بەچی دەکەیت؟!

ئـــارام گوتی: هەســـت بە تەنهایـــیو بێتاقەتیی دەکـــەم، ئایا مەبەستت ئەوەیە کە جووجەڵەکە هەست بە تەنهایی دەکات، لەبەرئەوەی نە هاوڕێیەکی لەگەڵدایە، نە دایەو بابەی؟!

دایکـــی گوتی: بەڵێ کـــوڕی خۆم، جووجەڵەکە هەســـت بە تەنهایی دەکات، دەڵێیت چی، ئەگەر چەند جووجەڵەیەکی دیکە

بکڕین‌و لەسەربان کولانەیان بۆ درووست بکەین؟

ئــارام بەم پێشـــنیارەی دایکی زۆر دڵخۆش بوو، لە خۆشـــیدا هەڵدەپەڕی‌و سوپاســـی دایکی دەکرد، بەم شێوەیە جووجەڵەکان پێکەوە بە دڵخۆشـــیی دانیان دەخـــواردو یارییان دەکردو ژیانیان بەخۆشی بەسەر دەبرد..

پوختە:

✍ منداڵە چاوگەشـــەکان، ئەمەش ئـــەوە دەگەیەنێت، کە هیچ کام لە باڵندەکان بە تەنها خۆشحاڵ نین، ئەگەرچی خزمەتی زۆریشـــیان بکەیت، کەواتە گەر دەتەوێـــت باڵندەیەکی ماڵی لە ماڵەوە ڕابگریت، ئـــەوا هەرگیز بە تەنهـــا باڵندەیەك ڕامەگرە، هەوڵ بدە چەند دانەیەك بن، تا پێکەوەو ئاسودەو بەختەوەرانە ژیان بگوزەرێنن، چونکە هەرچەندە تۆ خزمەتی تەنها باڵندەیەك بکەیت‌و جێگەی تایبەتی بۆ دروســـت بکەیت‌و خواردنی خۆش‌و ئاوی پێ بدەیت، ناتوانیت بەختەوەری بکەیت‌و خۆشحاڵی بکەیت، ئەگەر چەند هاوڕێیەکی لە ڕەگەزی خۆی لەگەڵدا نەبێت..

✍ خواردن‌و ئاو، ڕاســـتە ســـەرچاوەی ژیانە، بەڵام ناتوانێت دەروون ئارام‌و ئاسوودە بکات.

✍ چونکە تەنهایی ســـەختەو تەنانەت باڵندەکانیش بەرگەی ناگرن!

روئیـــا هەموو بەیانییەك زوو لە خـــەو ڕادەبورد، پەنجەرەی ژوورەکانـــی دەکـــردەوەو جێگـــەو نوێنەکانی ڕێك دەخســـتو دەستو دەموچاوی بە ئاوو ســـابوون دەشۆریو هاوکاری دایکی دەکرد لە ئامادەکردنی نانی بەیانیداو پاشـــان هەمووان لەســـەر خوانی بەیانیان کۆدەبوونەوەو پێکەوەو بەوپەڕی ئاسوودەیی نانی بەیانیان دەخوارد، پاشـــان روئیا ددانەکانی بە فڵچەو مەعجون دەشۆریو خۆی ڕێك دەخستو جلوبەرگی قوتابخانەی دەپۆشیو ماڵئاوایی لە دایكو باوکی دەکردو دەڕۆیشت بۆ قوتابخانە.

روئیا لـــە قوتابخانە کچێکی زیرەكو لێهاتوو بوو، هەمیشـــە ئەو شـــتانەی کە نەیدەزانی، یان تێنەدەگەیشـــت پرســـیاری لە مامۆستاکەی دەکردو نەیدەهێشت هیچ شتێك بەسەریدا تێبپەڕێت کە لێی تێ نەگات..

لە کاتی پشـــوودا دەڕۆیشـــت بۆ کتێبخانـــەی قوتابخانەکەو چیرۆکە بەسوودەکانی دەخوێندەوە، بەتایبەت ئەو چیرۆکانەی کە باسیان لە سەرکەوتنو کۆڵنەدانو بەردەوامبوون دەکرد.

روئیا قوتابییەکی بە ئەدەبو ڕەوشـــتبەرزو ژیرو سەنگینو بێدەنگ بوو، هەموو مامۆستاکانو هاوپۆلەکانی خۆشیان دەویست، هەرگیـــز دڵی کەســـی ئازار نـــەدەدا، بە بێدەنگی لـــە پۆلەکەی

دادەنیشتو بە پەرۆشەوە گوێی بۆ مامۆستاکەی ڕادەدێرا!

کاتێکیش دەگەڕایەوە ماڵ سڵاوی لە دایکی دەکردو دەڕۆیشتە ژوورەکەی خۆی، جلوبەرگی قوتابخانەی دەگۆڕیو جلی ماڵەوەی لەبەر دەکرد، جلەکانی لـــە نێو کانتۆرەکەی بەڕێکوپێکی دادەنا، هەرگیز کەلوپەلەکانی لەملاولا فڕێ نەدەدا، ژوورەکەی هەمیشە ڕێکو جوانو خاوێن بوو، پاشان دەڕۆیشتە چێشتخانەو هاوکاری دایکی دەکـــرد لە ئامادەکردنی خوانی نیـــوەڕۆدا، پاش نانخواردنی نیوەڕۆو هەڵگرتنەوەی خوانەکەو شـــۆردنی قاپو قاچاخەکان، دەڕۆیشـــتەوە بۆ ژوورەکەی خۆیو خشتەی وانەکانی بۆ سبەی جیادەکـــردەوەو دەســـتی دەکرد بـــە نووســـینەوەو ئامادەکردنی وانەکانی ڕۆژی دواتر..

کاتژمێرێك پێش خۆرئاوابوون لەگەڵ خوشکە بچووکەکەیدا یاری دەکرد، یان ســـەیری فیلمێکی پەروەردەیی دەکرد، تا شـــتی بەسوودی لێوە فێربێت..

شەوگاریش ئەگەر ئەرکی قوتابخانەی بمایە، دەچووە ژوورەکەی خۆیو ئەرکەکانی تـــەواو دەکردو بە تەواوی خۆی ئامادە دەکرد بۆ قوتابخانـــە، خۆئەگەر ئەرکی قوتابخانەی نەمابا، ئەوا لەگەڵ دایکو باوکیو خوشکە بچووکەکەی پێکەوە دادەنیشتنو کاتێکی

خۆشیان بەسەر دەبرد، یان دەچوونە سەردانی ماڵی خزمو کەسوکارەکانیان.

ڕۆژێکیان بانگهێشتێکیان پێگەیشت کە هەر کچێك دەیەوێت بەشداری ئەم پێشبڕکێیە بکات، ناوی خۆی تۆمار بکات، پێشبڕکێکە بە مەبەستی دیاریکردنی کچی نموونەیی گەڕەك بوو، هاوکات لەبەرئەوەی روئیا کچێکی جوانو ئاکار بەرزو سەنگینو خۆشەویستی هەمووان بوو، دایکی ناوی روئیای بۆ بەشداری کردن لە پێشبڕکێکە تۆمار کردبوو، بەبێئەوەی بە روئیا بڵێت.

لە ڕۆژی پیشبڕکێکەدا، دایکی روئیا وتی: وەرە بابڕۆین بۆ ئەو پێشبڕکێیە، پێکەوە ڕۆیشتن بۆ هۆڵی پێشبڕکێکەو چاوەڕوانی دەستپێکردنی پێشبڕکێکەیان دەکرد، تا تیایدا ناوی باشترینو نمونەیی ترین کچانی گەڕەك بخوێنرێتەوە..

پێشبڕکێ دەستی پێکرد، لیژنەی ئامادەکار دەستیان کرد بە خوێندنەوەی ناوی باشترینو نمونەیی ترین کچانی گەڕەك، سوپرایزێکی سەیر بۆ روئیا ڕوویدا، هەر کە یەکەم ناو خوێندرایەوە گوێی بە ناوی خۆی زرنگایەوە..

هەمووان دەستیان بە چەپڵەڕێزان کرد، روئیاش لە باوەشی

دایــکو باوکیدا بــوو، له خۆشــیدا فرمێســك لــه چاوەکانی هەڵدەوەراند، وتی: دایەگیان زۆر سوپاستان دەکەم.

پاشــان روئیا بەرەو تەختی شانۆکە کەوتە ڕێ، بۆ وەرگرتنی خەلاتــی کچی نمونەیــی، دوای ئەوەی خەلاتەکــەی وەرگرت، وتی: دایەگیان بەڕاســتی تۆ شــایەنی ئەو خەلاتەیت، چونکە تۆ منت فێری هاوکاریو خۆشەویســتیو ڕاستگۆییو لێبوردنو ورەبەرزیــیو چەندەها ئــاکاری جوان کرد، تۆ منــت هان داو هاوکاریــت کردم تا لە خوێندنگە ســەرکەوتوو بم، هەمیشــە هاوکارو یارمەتیدەرم بوویت..

ئامادەبووانی پێشــبڕکێکە هەمووان پێکــەوە چەپڵەبارانیان کردو وتیان: بەڕاستی تۆ شایەنی ئەوەی ببیتە کچی نمونەیی!

پوختە:

✍ هەر یەك لە کچە کوڕو لاوەکانمان دەتوانن هەوڵ بدەن تا ببنە کەســی نموونەیی، بێگومان بە ئاکاری جوانو ڕەوشــتی بەرزو گیانی هاوکاریو نەرمونیانیو لەســەرخۆییو گرنگیدان بە ئەرکی قوتابخانەو ماڵ!

مام کەماڵ خاوەنی دوکانی فرۆشتنی سەوزەو میوە بوو، پیاوێکی خۆش قسەو مامەڵە شیرین بوو، هەمووان خۆشیان دەویست، سەوزەو میوەکانی مام کەماڵ هەمیشە لە هەموو دوکاندارەکانی دیکە جوانتر بوو، هاوکات نرخەکەشی هەرزانتر بوو، چونکە پیاوێکی بێ تەماح بوو، بە قازانجێکی کەم ئەیفرۆشتەوە، بۆئەوەی هەمیشە ڕۆژانە میوەو سەوزەکانی تەواو بکاتو بۆ ڕۆژی دواتر سەوزەو میوەی تازە بهێنێت، ئەمەش وایکردبوو کە هەمو دانیشتوانی گەڕەك بۆ کڕینی سەوزەو میوە دەڕۆیشتن بۆ لای مام کەماڵ..

ڕۆژێك پەیام لەگەڵ دایکی دەڕوات بۆ دوکانی مام کەماڵ، بۆ ئەوەی هەندێك سەوزە بکڕن بۆ زەڵاتە، دایکی بە پەیامی گوت: هاوکاریم بکە لە هەڵبژاردنی سەوزەکان بۆ ئەوەی زەڵاتەیەکی خۆش دروست بکەین، پەیام تەماتەو خەیارو گوێزەرو لیمۆو کاهوو پیازی هەڵبژاردو کردییە نێو عەلاگەوەو چووە ڕیزەوە تا لای تەرازووەکە بیانکێشێتو نرخەکەی بدات بە مام کەماڵ..

بەڵام پەیام گوێی لە دەنگێك بوو، دەیگوت دوورکەوەرەو لێم خاتوو پیاز، من حەز بەو بۆنە ناخۆشەی تۆ ناکەم!

لیمۆ هاتە دەنگو وتی: خاتوو تەماتە لێرە چی ڕوودەدات؟ کێشەتان چییە؟

تەماتە وتی: من ڕقم لە بۆنی پیازە، پیازیش هاتۆتە تەنیشتمەوەو

بێزاری کـــردووم، تکایە پێی بڵێ دوورکەوێتەوە لێم، خاتوو پیاز هیچ ســـوودێکی نییە! ئەو وەکو من بەســـوودو بەتام نییە! هیچ زەڵاتەو خواردنێك بێ من دروســـت ناکرێت، چەندەها ڤیتامینی بەسوودم تێدایە بۆ جەستەی مرۆڤ!

خاتوو پیـــاز زەردەخەنەیەکی کردو هاتە گـــۆ: بەڕێز خاتوو تەماتە، بە پێچەوانەوە من زۆر بەسوودم، لەبیرت نەچێت من لە هەموو ژەمە خۆراکەکاندا لەگەڵ تۆدا بەشـــداری دەکەم، من وەکو تۆ بۆ مرۆڤ بە ســـوودم، تەنانەت یارمەتی چاکبوونەوەی مرۆڤ دەدەم لە ســـەرماو هەڵامەت، من دژە شـــێرپەنجەم، زۆر بەسوود بۆ ئەو کەسانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە!

لیمۆش وتی: بەڵێ من ئەوانە دەزانم، لە ڕاســـتیدا منیش وەکو تۆ بەسوودم خاتوو پیاز، بۆ چارەسەری سەرما بەکاردەهێنرێم، زۆرێك ڤیتامینم لە خۆ گرتووە، لە دروستکردنی خواردنو زەڵاتەو سرکەدا بەکاردەهێنرێم، هەروەها شەربەتی بەتامم لێ دروست دەکرێت!

لەو لاوە کاهوش کە گوێی لەم مشتومڕەبوو، دەستی کرد بە پێکەنینو وتی: بەڵێ منیش ئەو ڕاســـتییانە دەزانم، بەڵام بەڕێز گوێزەر بۆچی بێدەنگەو هیچ قسەیەك ناکات، بەڕێز گوێزەر وتی: مـــن لە دوورەوە ســـەیر دەکەم، بزانم چـــی ڕو دەدات، من زۆر بەســـوودم بۆ بینین، هێزی بینینی مرۆڤ زیـــادو بەهێز دەکەم،

هەروەها زۆر بەهێزم بۆ دڵو جەستە، مرۆڤ لە دروستکردنی مرەباو سرکەو زۆرێك لە ژەمە خۆراکییەکان بەکارم دەهێنێت، کەواتە منیش وەکو ئێوە بەسوودم، بەڵام من بینیم خاتوو تەماتە خاتوو پیازی نیگەران کرد.

سەوزەکان هەموو بێدەنگ بوون، سەیرێکی خەیاریان کرد پێیان وت: تۆ بۆ قسەیەك ناکەیت، خۆ تۆش ئەندامێکی لە ئێمەو هاوبەشی دەکەیت لەگەڵماندا لە دروستکردنی زەڵاتەیەکی بەتامدا، زۆر بەسوودی بۆ پێستی مرۆڤ، ژەهری جەستەی مرۆڤ دەکەیتە دەرەوە، تکایە هاوکارمانبە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە، هەمووومان بە دادوەری تۆ ڕازین..

بەڕێز خەیار وتی: هەمووومان پێکەوە هاوکارین بۆئەوەی سوود بە جەستەی مرۆڤ بگەیەنین، هەر یەك لە ئێمە بە شێوەیەکی جیاواز سوود بە جەستەی مرۆڤ دەگەیەنێت، واتە هەر یەکەمان بۆ شتێك باشین، نابێت مشتومڕ لە نێوانماندا دروست ببێت، چونکە هەمووومان پێکەوە دەتوانین هاوکاربین، هەم بۆئەوەی زەڵاتەیەکی بەتامان لێ دەربچێت، هەم بۆئەوەی سوود بە هەموو لایەنەکانی جەستە بگەیەنین!

خاتوو تەماتە بە ڕای من دەبێت تۆ داوای لێبوردن لە خاتوو پیاز بکەیت!

خاتوو تەماتە لەبــەردەم هاوڕێکانیدا زۆر داوای لێبوردنی لە خاتوو پیاز کردو ئیدی سەوزەکان هەمووان پێکەوەو بەوپەڕی خۆشــحاڵییەوە دەســتیان کردە پێکەنین، لەو کاتەدا مام کەمال بانگی پەیامی کردو وتی: کچم وەرە با سەوزەکانت بۆ بکێشم!

پەیام ســەوزەکانی دایە دەســتی مام کەماڵو پاش کێشــانەی نرخەکەی پێدا، دواتر لەگەڵ دایکی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، لە ڕێگە پەیام تــەواوی چیرۆکەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە، دایکی دەســتی کردە پێکەنینو وتی: ڕاستەکەی کچی خۆم، بەڵام خۆ سەوزەکان قسە ناکەنو مشتومڕ لە نێوانایاندا دروست نابێت هەهەهەهە..

پەیام دەستیکرد بە پێکەنینو وتی: دیارە من خەوم لێکەوتووە لە خەوما ئەوەم بینیوە هەهەهەهەهە!

پوختە:

✍ منداڵە چاوگەشــەکان، لە ڕاســتیدا هەموو ســەوزەکان ســوودیان هەیە بــۆ مرۆڤ،ئەوان بە هەموویان دەتوانن ســودی تەواو بە ئێمە بگەیەننو خواردنی خۆشــمان پێشــکەش بکەن، هاوشــێوەی مرۆڤەکان ئێمەش بە هەموومان دەتوانین ســوود بە نیشتمانو وڵاتمان بگەیەنین، کەسمان بێ سوود نین، نابێت ڕقمان لە یەکتری بێتو مشتومڕو کێشە لە نێوانمان دروست ببێت!

لــه دێر زەماندا شــوانێکی هەژارو دڵپاکو دەســتپاك هەبوو، ڕۆژانە مەڕوماڵاتەکەی دەبردە لەوەڕگاو کەژو کێوەکان، ئێواران بە ماندوویی دەگەڕایەوە ماڵ، پێکەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی نانی ئێوارەیــان دەخوارد، کاکی شــوان چونکە بە ڕۆژدا ماندوو بوو، هەر زوو چاوەکانی دەچوونە خەو..

ڕۆژێکیان هاوســەرەکەی پێی گوت: ئازیــزم دەڵێی چی، کە من خۆم فێری ڕســتنو چنین بکەم، بۆئەوەی ســورد لە خوری مــەڕەکان وەربگرین، تۆ خورییەکەم بــۆ بهێنە، منیش دەیچنمو دەیفرۆشمو بە پارەکەی داهاتمان زیاد دەبێت، تۆش سەرپەرشتی مەڕەکان دەکەیتو قەڵەویان دەکەیتو پاشــان دەیانفرۆشین.. بەم شێوەیە سەروەتو سامانو داهاتمان زیاد دەکات؟؟

کاکی شــوان وتی: بەڕاســتی پێشــنیارێکی جوانــە، زۆریش بەسوودە، بەڵام من خۆم خورییەکە دەبەم بۆ بازاڕو دەیفرۆشم.. چونکە ئەو ئەرکە قورسە بۆ تۆ، من ئەنجامی دەدەم!

لــەو ڕۆژە بەدواوە کاکی شــوان، هەمــوو ڕۆژانێکی هەینی کەســێکی دیکەی دەنــاردە لای مەڕەکانو خــۆی ئەو خورییەی هاوسەرەکەی دەیڕست، دەیبردە بازاڕو دەیفرۆشت، لەبەرئەوەی خوریەکەیــان زۆر پاكو بێ فێڵ بوو، شــوانو هاوســەرەکەی

دوو کەســـی زۆر سەرڕاست بوون، بە ماوەیەکی کەم ناوبانگی لـــە نێو خەڵکیدا پەیدا کردو خەڵکی لـــە هەموو لایەکەوە لێی کۆدەبوونەوەو هەر زوو بەرهەمەکەیان لێ دەکڕیو کاکی شوان بە دڵخۆشی دەگەڕایەوە ماڵ..

بەمشێوەیە ژیانیان بەردەوام بوو، داهاتو سامانیان تا دەهات زیاتر دەبوو، ناوبانگی باشیو سەرڕاستیان بەردەوام لە زیادبوندا بوو..

ڕۆژێـــك لـــە کاتـــی گەڕانـــەوەی کاکی شـــوان بـــۆ ماڵەوە، ئەسپسوارێکی بینی لە ئەســـپەکەی کەوتبووە خوارەوە، لەبەر ئازار نەیدەتوانی هەڵسێتە سەرپێ، کاکە شوانەی مرۆڤ دۆست، لێی نزیك بووەوەو چووە ژێرباڵییەوەو هەڵی گرتو بردییەوە بۆ ماڵەوە، ئەو شـــەوە میوانداری کردو ڕێزێکی زۆری لێگرت، تا بۆ ڕۆژی دواتر ئەسپســـوار ئازاری نەما بە تەواوی باشبوو، پاشان سوپاسی کاکی شوانی کردو مۆڵەتی ڕۆیشتنی خواست..

هەرچەندە ئەو ڕۆژە هەینی بوو، کاکی شوان نەیتوانی لەبەر میوانەکەی بچێتە بازاڕ، بەڵام هاوکات زۆر دڵخۆشـــبوو، چونکە توانیبـــوی خزمەتی ڕێبوارێك بکاتو ڕێزی لێ بگرێتو بە جوانی میوانداری بکات!

بۆ هەینی دواتر کاکی شوان وەك ڕۆژانی پێشووی بەرەو بازاڕ

کەوتەڕێ، بۆئەوەی بەرهەمی خوری هاوســـەرەکەی بفرۆشێت، کاکی شوان چاوەڕێ بوو وەکو ڕۆژان خەڵکی بە خۆشحاڵییەوە لێـــی کۆببنەوە، بەڵام بە پێچەوانـــەی ڕۆژانەوە خەڵکی هەموو بە گازندەو گلەیی‌و بۆڵەبۆڵەوە بەرەو ڕووی کاکی شوان هاتن‌و سکاڵایان کرد، کاکی شـــوان کە ئاگای لە هیچ نەبوو، نەیدەزانی چی ڕوو دەدات، بەسەرسوڕمانەوە پرسی: ئایا شتێك ڕوویداوە؟

خەڵکەکە وتیان: هەینی پێشـــوو تۆ فێڵـــت لێ کردووین، ئەم خورییەمـــان لە تۆ کڕیوە، بەڵام جۆرەکەی باش نییەو زۆر خراپە، ئێمە متمانەمان بە تۆ هەبوو، بەڵام تۆ متمانەی خۆت لە دەست دا!

شـــوانەکە بەسەرســـامییەوە وتی: بەڵام من هەینی ڕابردوو نەهاتووم بۆ بازاڕ، چونکە میوانم هەبووە!

خەڵکەکـــە وتیان: ڕاســـتە خۆت نەهاتووی، بەڵام کەســـێك هات‌و لەو شوێنەی تۆ ڕاوەستاو وتی: ئەمڕۆ من خورییەکەی بۆ دەفرۆشم، لەبەرئەوەی ئەو ناتوانێت بێت!

شـــوانەکە وتی: بەڵام من هیچ کەســـم نەنـــاردووە! بڕوام پێ بکەن من هەرگیز درۆ ناکەم!

خەڵکەکـــە وتیان کەواتە با بچینـــە لای قازی تا لە نێوانماندا دادوەری بکات!

شـــوانەکەو خەڵکەکە پێکەوە ڕۆیشتن بۆ لای قازی، کاتێك گەیشـــتنە دادگا شوانەکە بە بینینی قازی سەرسام بوو، چونکە قازی ئەو کەســـە بوو، کە هەینـــی ڕابردوو میوانی بووەو ڕێزی گرتووەو یارمەتی داوە!

قازی بە دیتنی کاکی شـــوان، هەســـتایە ســـەرپێو بە گەرمی بەخێرهاتنی کرد، پاشان وتی: فەرموو دانیشن، دواتر جەنابی قازی تەواوی ڕووداوەکەی بۆ ئامادەبووان گێڕایەوە، خەڵکەکەش هەموو بڕوایـــان کرد کە هەینی ڕابردوو کاکی شـــوان نەهاتووە بۆ بازاڕ، پاشـــان دەســـتیان کرد بە گەڕان بەدوای ئەو کەسەی کە دەستی بڕیونو درۆی لەگەڵدا کردوون، تا سزای بدەنو تەمێی بکەن!

زۆر ڕاستە کەس نازانێت خێر لە چیدایە!

پاشان شوانەکە زۆر سوپاســـی جەنابی قازی کردو وتی: ئەم چاکەیەت هەرگیز لە یاد ناکەم!

قازیش وتی: پاداشتی چاکە هەر چاکەیە!

پوختە:

✍ چاکـــە بکەو بیدە بە دەم ئاوەوە، ڕۆژێك دێت دیتەوە ڕێت.. هەمیشە ڕاستگۆو سەر ڕاستبە، دڵنیابە سەربەرز دەبیت.

له دارســـتانێكدا مــاڵ گەلێكی زۆری مێروولـــەی لێبوو، هەر یەكەیان ســـەرقاڵی ژیانو گوزەرانی خۆیان بوونو بە خۆشیو شـــادی لەگەڵ بێچووەكانیان ژیانیان دەگوزەراند، یەكێك لە ماڵە مێروولـــەكان، كە لە نـــاو هەمووان‌دا بە ڕۆح ســـوكو چاكەكار ناســـرابوو، پێكەوە لەگـــەڵ منداڵەكانی بە ئاســـوودەیی ژیانیان دەگوزەراند..ڕۆژێكیان دایكە مێروولە نەخۆش كەوت، نەیدەتوانی بڕواتە دەرەوەو خواردن بۆ بێچووەكانی پەیدا بكات، لەولاشەوە بێچووەكانی هەستیان بە برسێتی كردو بێتاقەتو ماندووبوون.. ناچار ڕۆیشتن بۆ لای دایكیانو پێیان گوت: دایە برسێتی بڕستی لێ بڕیوین، تكایە چارەسەرێكمان بكە؟

دایكە مێروولە بەو بارودۆخەوە كەمێك بیری كردەوەو وتی: زۆرباشە ڕۆڵەكانم، هەر ئێستا دەڕۆم خواردنتان بۆ پەیدا دەكەم.. هەر چۆنێك بێت بە ماندوویيو ئازارەوە ڕۆیشتە دەرەوە، بیری كردەوە كە داوای یارمەتی لە خاتوو نمەی هاوڕێی بكات.. بۆ ئەو مەبەســـتە ڕۆیشتە ماڵی خاتوو نمەی دراوسێيو داوای یارمەتی لێكـــرد، كە تا ئەو كاتەی چاك دەبێتەوە بڕێك خواردنی بداتێ بۆ منداڵەكانی، چونكە زۆر برسییانە!

بەڵام خاتوو نمەی دراوسێی، وتی: ببورە خواردنم تەنها بەشی

خۆم‌و منداڵه‌کانم هه‌یه‌، ناتوانم یارمه‌تیت بده‌م!

مێروله‌ی دایك سوپاسی کردو ماڵاوایی لێکردو ڕۆیشت، ناچار به‌ نه‌خۆشی ملی ڕێگه‌ی گرته‌ به‌ر، تا خۆی بچێت خواردن بۆ منداڵه‌کانی په‌یدا بکات.

دوای چه‌ند ڕۆژێك مێرووله‌ی دایك به‌ ته‌واوی چاك بووه‌وه‌، ده‌ستی کرد به‌ کۆکردنه‌وه‌ی خۆراك بۆ منداڵه‌کانی، هه‌روه‌ها پێکه‌وه‌ له‌گه‌ڵ بێچووه‌کانی هه‌وڵی زۆریاندا تا خۆراك پاشه‌که‌وت بکه‌ن بۆ زستانیش، چونکه‌ دوای یه‌ك دوو مانگی دیکه‌ زستان دێته‌ پێش‌و به‌فروباران ڕێگه‌یان نادات بچنه‌ ده‌ره‌وه‌..

ڕۆژان هاتو چوو، زستان سلاوی کردو کوردوته‌نی به‌رگی هه‌ژاران دڕا، له‌ ڕۆژێکی باراناویدا، ئاو دزه‌ی کرده‌ ماڵی خاتوو نمه‌، چونکه‌ له‌ ته‌نیشت چاڵه‌ ئاوێکه‌وه‌بوو، هه‌موو ئه‌و خۆراکه‌ی هه‌ڵیانگرتبوو بۆ زستان ته‌ڕبوو، خۆی‌و بێچووه‌کانی ئه‌وه‌نده‌یان پێکرا که‌ بچنه‌ سه‌ر به‌ردێکی بڵند تا له‌ خنکان ڕزگاریان بێت، بۆ ڕۆژی دواتر خاتوو نمه‌و بێچووه‌کانی هه‌ستیان به‌ برسێتییه‌کی زۆر کرد، به‌ڵام چۆن بچنه‌ ده‌ره‌وه‌؟ ئه‌ی ده‌بێت چی بکه‌ن؟

خاتوو نمه‌ وتی: چاره‌یه‌ك نییه‌ ده‌ڕۆین بۆ ماڵی خاتوو مێروله‌ی دایك، ئه‌و دراوسێیه‌کی میهره‌بانه‌و ده‌توانێت یارمه‌تیمان بدات..

بەڵام کە بیری کردەوە ئەو ڕۆژەی ئەو هات بۆ لای داوای یارمەتی کــرد، ئەم داواکـــەی ڕەت کردەوەو خواردنی پێ نـــەدا، وتی: نا ناکرێــت بڕۆین، چونکە ئێمە لە تەنگانـــەدا یارمەتی ئەوانمان نەدا.. ئەی خودایە ئێســـتا دەبێت منو منداڵەکانم چی بکەین!؟ ڕوو لــە دەرگای کــێ بکەین، خۆ بەم زســـتانە ناتوانین خۆمان خۆراك پەیدا بکەین!

لەو بیرکردنەوانەدا بوون، لە دەرگای ماڵیان درا، کاتێك فەرموویان کــرد، بینیان ئــەوە خاتوو مێروولەی دایکە بە خــۆیو خواردنێکی باشـــەوە هاتووە بۆ لایان، پێی وتن: دراوسێ ئازیزەکەم هەواڵم زانی کە دوێنێ شـــەو چی ڕوویداوە، لەبەرئەوە وتم: ئێستا بێچووەکانی برسیانە با خواردنیان بۆ ببەم تا لەم تەنگانەیە ڕزگاریان بێت!

خاتوو نمە زۆر هەســـتی بە شـــەرمەزاری کرد، پاشـــان بە شـــەرمەوە سوپاســـی کردو وتی: بەڕاســـتی تۆ دراوســـێیەکی میهرەبانی. خاتوو مێرولەش وتی: ماڵی دراوسێ بۆ دراوسێیە..

پوختە:

منداڵە چاوگەشـــەکان هیـــوادارم ئێوەش لـــەم چیرۆکە پەنـــد وەربگرنو وەڵامی هەڵەی هاوڕێکانتان بە چاکە بدەنەوە، هەرگیز وەڵامی خراپە بە خراپە مەدەنەوە!

له دێــر زەمانداو له یەکێك له شــارەکان نەخۆشــی ... بە شــاردا بڵاوبووەوە، پادشــای وڵات بڕیــاری دا دوو لاوی زیرەك بنێرێت بۆ ئەو شــارەی کە لە زانســتی پزیشکیدا بەناوبانگن‌و زۆر پێشــکەوتوون، بۆئــەوەی ئەو دوو لاوە لەو شــارە فێری زانستی پزیشــکی ببن‌و پاشان بگەڕێنەوە بۆ شارەکەی خۆیان‌و چارەســـەری نەخۆشــەکانی شــارەکەیان بکەن.. جەنابی پادشا بڕیــاری دا مانگانەیەك بۆ هــەر یەك لەو دوو لاوە ببڕێتەوە بە بڕی ١٠٠ دیناری ئەو کاتە! هەروەها نامەیەکی بۆ نووســین تا بیگەیەننە پادشای ئەو شارەو لەوێ جێگەو ڕێگەو پێداویستی ژیانیان بۆ دابین بکات‌و باشترین حەکیم‌و مامۆستایان بۆ دابین بکات.

بۆ ڕۆژی دواتر مەحمودو ئەکرەم خۆیان ئامادەکردو ماڵاواییان لە ماڵ کردو بە ڕێکەوتن، جەنابی پادشا بە خۆی‌و جەماوەرێکی زۆرەوە ئامادەبوون‌و تا سنوری شار بە ڕێیان کردن‌و ڕێوڕەسمی شکۆدارانەیان بۆ سازدان!

هیوایان بۆ خواســتن کە بە زانســت‌و زانیاری‌و ســەلامەتی بگەڕێنــەوە بۆ لایان، تــا بتوانن ببنە هۆکار بــۆ چاکبوونەوەی منداڵ‌و بەساڵاچوانی شارەکەیان!

دوای چەنــد ڕۆژێك دوو لاوەکە گەیشــتنە ئەو شــارەی بە زانستی پزیشــکی ناســرابوون، دوو لاوەکە ڕۆیشتنە کۆشکی

پادشـــاو نامەی پادشـــاکەیان گەیاندە پاشـــای ئەو شارەو سڵاوی پادشایان پێگەیاندو خۆیان پێناساند، پادشای شار هەر کەنامەکەی خوێندەوە زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنی کردن‌و فەرمانی کرد کە سەرجەم پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ دابین بکەن‌و لە جێگەی حەوانەوەو هەموو کەلوپەلێك کە پێویستیانە.

ئیدی دەســـتیان کرد بە وانە خوێندن‌و هەوڵدان بۆ فێربوونی زانســـتی پزیشکی، مەحمود هەر لە ســـەرەتاوە زۆر بە جدی‌و بە گەرمی‌و پەرۆشـــەوە لە خزمەتی حەکیم‌و مامۆســـتاکانیدا دادەنیشـــتو بەوپەڕی پەرۆشییەوە گوێی بۆ ڕادەگرتن‌و هەوڵی فێربوونـــی دەدا، بەڵام ئەکرەم کاتەکانی خۆی لە بەســـەربردنی خۆشـــی‌و ڕەفاهییـــەتو خەرجکردنی ئـــەو برە پـــارە زۆرەدا بەسەردەبرد کە پادشا بۆی تەرخان کردبوو، زۆرجاریش دەچووە ڕاووڕاوشکارو گوێی بە کاتو وانە خوێندن نەدەدا!

هەرچەنـــدە مەحمود زۆر ئامۆژگاری دەکردو پێی دەگوت: کە ئەوان بۆ کارێکی گرنگ هاتوون‌و خەڵکانێك چاوەڕێی ئێمەیەو پێویســـتیان بەم زانســـتەیە، بـــەڵام ئەکرەم گوێی پـــێ نەدەدا بەردەوام بوو لە بەسەربردنی کاتەکانی لە شتی لاوەکیداو یاری‌و بەســـەربردنی کاتێکی خۆش. بەردەوام ڕۆژانە ئامادەی وانەکانی نەدەبوو، هیچ گرنگییەکیشی بە زانستی پزیشکی نەدەدا!

ڕۆژەکان تێپەڕین، تا ڕۆژێك حەکیمەکان نوسراوێکیان بەرز کردەوە بۆ جەنابی پادشاو پێیان ڕاگەیاند کە پێویستە پاداشتو خەلاتی مەحمود بکەنو مووچـــەی مانگانەکەی بۆ زیاد بکەن، چونکە ئەو قوتابییەکی زۆر ژیرو زیرەکەو بەردەوام لە هەوڵی فێربوندایە، هـــاوکات داوایان کرد کە ئەکـــرەم بنێردرێتەوە بۆ شـــارەکەی خۆی، لەبەرئەوەی هیچ کات ئامادەی وانەکانی نابێتو گرنگی بەم زانستە نادات!

جەنابی پادشا فەرمانی کرد کە ئەکرەم بگێڕنەوە بۆ شارەکەی خۆی، هەروەها موچەو پلەی مەحمودی زیاد کرد..

ئەکرەم بە شـــەرمەزاری گەڕایەوە بۆ شـــارەکەی خۆی، هیچ کەس بۆ پێشوازی نەهات، هاوکات مەحمود بەردەوام بوو لەسەر فێربوونی زانستی پزیشکی، زیاتر لە جاران خۆی ماندوو دەکرد، دوای تێپەڕبوونی دوو ســـاڵ، مەحمود بە تەواوی فێری زانستی پزیشـــکی بوو، لە زیهنیـــدا دەریایەك لە زانســـتو مەعریفەی هەلگرتبـــوو، هـــاوکات ئاواتەخوازبـــوو بتوانێـــت بگەڕێتەوەو چارەسەری نەخۆشەکانی شارەکەی بکات..

دوای وەرگرتنی بڕوانامەی پزیشکی، بڕیاریدا بگەڕێتەوە شار، پادشـــاو حەکیمەکان زۆر بەگەرمی مالاواییـــان لێکردو هیوای سەرکەوتنیان بۆ خواســـت، هەروەها کاتێك گەیشتەوە سنوری

شـــارەكەی خۆی بینی وا خەڵكێكی زۆر بۆ پێشوازی مەحمود بە ڕێزموە ڕاوەســـتاون، هەمووان بەگەرمیو زۆر بە پەرۆشـــەوە بەخێرهاتنەوەیان كردو خۆشحاڵییان بە گەڕانەوەی دەربڕی..

لەو ڕۆژە بەدواوە مەحمود نۆرینگەیەكی داناو یەك یەك نەخۆشی شارەكەی دەبینیو چارەسەری پێویستی بۆ دەكردن، مەحمود نهێنی بڵاوبوونەوەی نەخۆشـــی گەدەی دۆزییـــەوە، كە خەڵكێكی زۆری شـــارەكەی دووچاری ببوون، بەڵام بە ویســـتی خوداو پاشـــان بە هەوڵو ماندووبوونی مەحمود ژمارەیەكی زۆری خەڵكی شـــار بە تـــەواوی چاكبوونەوەو بە گورجوگۆڵـــیو چالاكییەوە گەڕانەوە سەر ئیشو كارەكانیان! لەولاوە ئەكرەم جگە لە گەستنی پەنجەی پەشیمانیو ڕشتنی ئارەقەی شەرمەزاریی، شتێكی دیكەی لە دەست نەدەهـــات، هەموو جارێك كە مەحمـــودی دەبینی زیاتر برینەكانی دەكولایەوە، ئەو بەدەســـت تاڵی شكســـتەوە دەیناڵاند، بەڵام ئەوە هەلی ژیانە ئاستەمە جارێكی تر دووبار ببێتەوە!

پوختە:

✍ زیرەكی بە تەنیا بەس نییە، بۆ بەدەستهێنانی سەركەوتنو ئاواتو هیواكانت، بەڵكو زیرەكی پێویستی بە هەوڵدانو ئارامگرتن هەیە..

✍ هاوكات ئەگەر هەلێك لە دەرگای دایت، هەوڵ بدە ســـوودی لێ ببینە، چونكە زەحمەتە جارێكی تر دووبارە ببێتەوە!

له دارســـتانێكدا كه ئـــاژەڵان پێكەوه به خۆشـــیو برایەتی ژیانیان دەگوزەراند، ڕێزیان له یەكتر دەگرتو هاوكاری یەكتریان دەكرد، بەڵام وەك وتویانه چەم بێ چەقەڵ نابێت، لەو نێوەندەدا ڕێوییەكـــی فێڵبازو بەدكار هەبوو، هەر جارەو پەلاماری بەچكه كەروێشكێكی دەداو دەیكردە ژەمێكی ئەو ڕۆژەی، كەروێشكەكان بـــەم كارەی ڕێوی فێڵباز زۆر نیگەران بـــوون، بەردەوام بیریان دەكردەوه كه پێویسته چی بكەن بۆ ڕێگه گرتن له ڕێوی فێڵباز!

بۆ ئەم مەبەســـته كەروێشـــكی دایك، به گریانەوه ڕۆیشت بۆ لای شـــێری پاشـــای دارستان، ســـكاڵای حاڵی خۆیانی بۆ كردو پێـــی گوت: كه ڕێوی فێڵبازو بـــەدكار هەر ڕۆژەی بەچكەیەكم دەفڕێنیو دەیكاته ژەمه خـــۆراك، ئێمەش لەو لاوازترینو توانای بەرگریكردنمان نییه!

پاشای دارستان به بیستنی ئەم هەواڵه زۆر نارەحەت بوو، له توڕەییدا دەســـتی به نەڕەنەڕ كرد، پاشان به كەروێشكی دایكی گـــوت: برۆ مەترســـه، بەڵێن بێت لەو ڕێویـــه فێڵبازو بەدكاره ڕزگارتان بكەم!

ڕێوی فێڵبـــاز ئاگاداری ئەم وتوێژه بوو، لەبەرئەوه ڕۆیشـــتو چەنـــد ڕۆژێك خۆی ونكـــرد، تا هیچ كام له گیانـــداران نەیبینن،

بەتایبەت پاشای دارســـتان، چونکە دڵنیابوو ئەگەر شێر بیبینێت لەناوی دەبات، دوای چەند ڕۆژێك كەرویێشكی دایك كە زانی ڕێوی دیار نەماوەو لە دەســـتی ڕزگاریان بووە، ڕۆیشـــت بۆ لای پاشـــای دارســـتانو سوپاســـی کرد، بەڵام پاشای دارســـتان پێی گوت: لەو ڕۆژەوە من بەدوای ڕێویدا دەگەڕێم، بەس تا ئێستا نەم دۆزیوەتەوە!

کەرویێشـــکەکە گەڕایەوە هێلانەکەی خـــۆی، ئاواتەخوازبوو کە لەمـــەودوا هەرگیز چاوی بەو ڕێوییـــە فێڵبازە نەکەوێت، بەڵام کاتێك گەیشـــتەوە ماڵ، بینی هەموو بێچووەکان دەگرینو فرمێســـکیان لە چاوان دێتەخوارەوە، چونکە ڕێوی هاتووەو برا بچوکەکەیانی ڕفاندووەو کردویەتیە خۆراکی ئەو ژەمەی!

کەرویێشـــکی دایك دەســـتی کرد بـــە بیرکردنـــەوە، تا ڕێگە چارەیـــەك بدۆزێتەوە، دواجار بڕیاری دا کـــە خۆی بەرگری لە بێچووەکانـــی بکات، ڕۆیشـــت لەگەڵ هەموو کەرویێشـــکەکان کۆبووەو پێکەوە ڕێککەوتن لەســـەر پلانێـــك بۆ ڕزگاربوون لە ڕێـــوی فێڵباز، ڕێککەوتن لەســـەر ئەوەی هەموو کەوریێشـــکە بچووکەکان بڕۆنە بەردەمی کولانەکەیانو دەست بە یاریکردن بکەن، ئەوانیـــش لە نزیك کولانەکەو لەســـەر ڕێگەکە چاڵێك هەڵ بکەنن، ناو چاڵەکەش پڕبکەن لە دڕكو داڵ، پاشان سەری

چاڵەکەیان بە لق و گەڵا داپۆشی.. بەشێوەیەك کە ڕێوی هەست نەکات ئەوە چاڵە، وابزانێت هەر ڕێگەکەیە!

لەو کاتانەدا ڕێوی هەستی کرد ئەوا بێچووە کەروێشکەکان خەریکی یاریو گاڵتەو گەپن، بە دڵخۆشییەوە ملی ڕێگەی گرتە بەر، بۆئەوەی دووبارە دانەیەکیان بخواتو سکی خۆی پێ تێر بکات..

هەروەکو ڕۆژان بە ئاسانیو بەبێ ترس لە کولانەکەیان نزیك بووەوە، کاتێك هەڵمەتی برد تا بێچووە کەروێشکێکیان بگرێت، لەناکاو خۆی لەناو چاڵێکی پڕ دڕكو داڵدا بینییەوە کە دەرچوون تێیدا زۆر ئاستەمە، کەروێشکەکانیش بەوپەڕی شادومانی خۆشییەوە دایانە قاقای پێکەنینو هەموو پێکەوە دەستیان کرد بە پڕکردنەوەی چاڵەکەو کردیانە گۆڕی ڕێوی فێڵبازو دڕندە! بۆ هەمیشە کەروێشکەکان لە ڕێوی فێڵبازو دڕندە ڕزگاریان بوو.

پوختە:

- پێویستە مرۆڤ بۆ چارەسەری کێشەو گرفتەکانی تەنها پشت بە خۆی ببەستێت.
- هەوڵ بدە خۆت کێشەو گرفتەکانی خۆت چارەسەر بکەیت.
- دڵنیابن سەرەنجامی هەموو ستەمو زۆرداریيەك لەناوچوونە!

ئەحمـــەد پیاوێکی بەخشـــندەو میهرەبانو دڵپـــاك بوو، هاوکات دراوســـێیەکی هەژارو کەم دەستو کەمدەرامەتی هەبوو، مەحمود هەتا بڵێی پیاوێکی باشو قسەخۆش بوو، بەڵام لە ڕووی ماڵو داراییەوە هەژارو نەدار بـــوو، ڕۆژێك مەحمود گەڕایەوە بۆ ماڵ، خێزانەکەی پێی ڕاگەیاند کە کوڕەکەیان نەخۆشە، ئەویش بەپەلە هەڵی گرتو بردی بۆ لای دکتور، دوای پشـــکنینو تیشـــكو ڕێکارە پێویستەکان، پزیشکەکە پێی ڕاگەیاندن کە کوڕەکەیان پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە، نەشتەرگەرییەکەش پارەیەکی زۆری تێدەچێت..

مەحمـــودو خێـــزانو منداڵەکـــەی گەڕانەوە مـــاڵو بیریان لـــە ڕێگە چارەیەك کـــردەوە، لەبەرئەوەی مەحمود کەســـێکی شـــەرمنو لەســـەرخۆ بوو، ڕووی نەدەهات ئەم بابەتە لەگەڵ دراوســـێکەی، یان خزمو کەسە نزیکەکانی باس بکات، هەربۆیە بیری لە فرۆشـــتنی خانووەکەی کـــردەوە، بە خێزانەکەی گوت: خانووەکەمان دەفرۆشـــینو خانوویەکـــی بچکۆلانە دەکڕینەوە، ئەگـــەر یەك ژووریـــش بێـــت تیایدا دەژیـــن، بـــە باقییەکەی نەشتەرگەری کوڕەکەمانی پێ ئەنجام دەدەین.

پاشـــان دەســـتی کرد بە گەڕان بۆ دۆزینەوەی کەســـێك کە خانووەکەیان لێ بکڕێت، لەو دەمەدا ئەحمەدی دراوســـێیان ئەم

هەواڵەی بیســـت، کە دراوسێکەی بۆ نەشـــتەرگەری کوڕەکەی دەیەوێـــت خانووەکـــەی بفرۆشـــێت، بێئەوەی بچێـــت بۆ ماڵی ئەحمەدی دراوسێیان، ڕۆیشت بۆ نەخۆشخانە، تەواوی تێچووی نەشتەرگەرییەکەی تەسلیم کردو پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵ، بینی وا مەحمود کەســـێکی هێناوە ســـەیری خانووەکـــە بکات تا پێی بفرۆشێت، گوێی لێ بوو مەحمود بە کڕیارەکەی دەگوت: هەرگیز پەشیمان نابیتەوە، لەبەرئەوەی دراوسێییەکم هەیە، زۆر باش‌و دڵفراوان‌و میهرەبانە، خەڵکی گەڕەك هەموو خۆشیان دەوێت، تا ئێستا نەم بیستووە کەس بە خراپە باسی بکات.

لەو کاتەدا ئەحمەد چووە ژوورەوەو ســـڵاوی لێکردن‌و وتی: بـــەڵام تۆ بیرت چووە کە من بـــراو هاوڕێی تۆم، هەرگیز ڕێگە نادەم لێم دوورکەویتەوە!

پاشـــان داوای لێبوردنی لە کڕیارەکە کردو دەستی مەحمودی گرت‌و وتی: برای شیرینم کوڕی تۆ برازای منە! چۆن ڕێگە دەدەم تۆ خانووەکەت بفرۆشـــیت‌و لێمان دووركەویتەوە، من ڕۆیشتم بۆ نەخۆشـــخانەو تەواوی تێچووی نەشتەرگەرییەکەم تەسلیم کردووە، هیچ خەمی پارەت نەبێت!

دواتر ئەحمەد بەردەوام یارمەتی مەحمودی دراوســـێی دەداو

هەموو ڕۆژێك سەردانی دەکردنو پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکردن، تا ئەو کاتەی منداڵەکەیان بە تەواوی چاك بوومەوە!

هەر ئەوەش نـا، بەڵکو لەو ڕۆژە بـەدواوە مەحمودی کردە هاوبەشـی خۆی لە کاری بازرگانیدا، پێکەوە بازرگانی قوماشیان دەکرد، خودای گەورەش بە هۆی ئەو دڵپاکیو نییەت پاکییەیانەوە بەرەکەتی زۆری بەسـەردا ڕشـتبوون، تا ئەوەی هەر دووکیان ببونە دوو کەسـی خێرخـوازو دڵفراوان، بـەردەوام یارمەتی نەخۆشو کەمدەرامەتو هەژارەکانیان دەدا..

هاوڕێیەتی ئەحمەدو مەحمود هێندە خۆشـبوو، وای لێهاتبوو خەڵکی وەکو نمونە باسیان لێوە دەکردن.

پوختە:

✍ منداڵە چاو گەشـەکان ئەگەر بوویتە کەسـێکی خاوەن سەروەتو سامان، هەرگیزهەژارو کەمدەرامەتەکانت لەبیرنەچێت.

✍ هەرگیز لە بەخشـین مەترسـە، ماڵ بە بەخشین کەم ناکات، بەڵکو بەرەکەتی تێدەکەوێتو سەدان قات زیاد دەکات.

✍ ئەگەر هاوڕێیەکت هەیە، نەبوو نەدارە، ئەحمەدو مەحمود بکەرە پێشەنگی خۆتو چاویان لێ بکە، بزانە دراوسێو هاوڕێکانت لە هەموو کەس لە پێشترن کە چاکەیان لەگەڵدا بکەیت!

چەند ئاواتەخوازبووم سەعاتێکم بە دیاری بۆ بێت، وەکو سەعاتی هاورێکەم جوانو ناوازە بێت، ڕۆژێکیان بە باوکمم وت: بابەگیان دەتوانیت سەعاتێکم بۆ بکڕیت؟

باوکم لە وەڵامدا وتی: بە چاوان بەڵام کاتێك لە قوتابخانە دەرچوویت، سەعاتێکی جوانت بە دیاری بۆ دەکڕم!

ناچاربووم چاوەڕێی هاتنی کاتی تاقیکردنەوەکانو سەرکەوتنم بکەم لە تاقیکردنەوەکاندا، ڕۆژەکان تێپەڕین، ڕۆژێکیان من لە قوتابخانە دەگەڕامەوە، لە ڕێگەدا قوتویەکی پێچراوەم بینی کە بە کاغەزی دیاری پێچرابووەوە، لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، منیش هەڵم گرتەوەو خستمە ناو جانتاکەم!

کاتێك گەیشتمەوە ماڵ، چوومە ژوورەکەی خۆمو قوتووەکەم کردەوە، کاتێك کردمەوە سەرسام بووم، ئەوە من چی دەبینم، سەعات! بەڵام چ سەعاتێك، ئاڵتونی، تۆ بڵێی هەر بەڕاستی ئاڵتون بێت!

هەرچەندە بۆ دەستی من گەورە بوو، بەڵام کردمە دەستمو ڕۆیشتم بۆ لای دایکم، ئەو لە چێشتخانە خەریکی ئامادەکردنی نانی نیوەڕۆ بوو، وتم: دایەگیان سەیرکە، ئەم سەعاتە چەندە جوانە!

دایکم بەسەرسوڕمانەوە سەیری کردو پرسی: ئەمە چییە؟

بەڕاســـتی ئەوە سەعاتێکی زۆر جوانە، هی کێیە ئەو سەعاتە؟ بۆچی بە تۆیە؟

منیش وتم: دایە گیان ئەو سەعاتە هی خۆمە!

دایکم وتی: چۆن کوڕەکەم، ئایا کڕیوتە؟

وتم: نەخێر دایەگیان، نەم کڕیوە، لە نزیك دوکانی مام سەلیم لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، منیش هەڵمگرتەوەو هێنامەوە!

دایکـــم وتی: کەواتە ئەو ســـەعاتە هی تۆ نییـــە، ئەوەماڵی کەســـێکی ترە، پێویستە هەر ئێســـتا بڕۆیتو بگەڕێی بەدوای خاوەنەکەیداو بۆی بگێڕیتەوە!

وتم: دایە گیان من ئاواتەخوازبووم ببمە خاوەنی ســـەعاتێکی لەو شێوەیە، ئێستا بوومەتە خاوەنی، ئێستا بڕۆم بگەڕێم بە دوای خاوەنەکەیدا، بۆی بگێڕمەوە، کە هەر نایناسمو نازانم کێیە؟

دایکم وتی: کوڕی شـــیرینم، باوکت بەڵێنـــی پێداویت ئەگەر ســـەرکەوتوو بیت لە قوتابخانە، سەعاتێکی جوانت بۆ دەکڕێت، بەڵام ئەم ســـەعاتە هی تۆ نییە، خودا لێپرســـینەوەت لەگەڵ دا دەکات، لەســـەر ئەوەی شـــتێك هی تۆ نەبێتو بیکەیتە موڵکی خۆت.. مرۆڤەکان پێویســـتە دەستپاكو ئەمین بن، ئەمانەتەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان..

بە بیســـتنی ئامۆژگارییەکانی دایکم، هەســـتم بە شەرمەزاری

کرد، زانیم قســەکانی دایکم ڕاستەو ئەو سەعاتە هی کەسێکی تــرە، وتم: دایەگیان پێم بڵێ چۆن خاوەنەکەی بدۆزمەوە تا بۆی بگێڕمەوە؟!

دایکم وتی: تۆ لە نزیك دوکانی مام سەلیم دۆزیوتەوە، لەوانەیە کەســێك لەو نزیکانە، لە دوکانێکی سەعات فرۆشتن کڕیبێتی، بڕۆ لەو نزیکانە پرســیار بکە، بێگومان ئێستا لەوانەیە ئەویش بەدوایدا بگەڕێت!

منیش ڕۆیشــتم تا گەیشــتمە دوکانی مام ســەلیم، خەڵکێکی زۆرم بینی، وەکو ئەوەی چاوەڕێی من بکەن، هەموویان بە دوای سەعاتێکدا دەگەڕان کە لە نێو پاکەتێکدا پێچراوەتەوە..

منیــش کــە زانیم بــە دوای ئــەو ســەعاتەدا دەگەڕێن، پێم وتــن ســەعاتەکەتان لای منە، ئەوانیش زۆر خۆشــحاڵ بوون، ســەعاتەکەم بــۆ گێڕانــەوەو داوای لێبوردنم لێکــردن لەوەی پاکەتەکەم کردووەتەوە، لەبەرامبەردا ئەوان زۆر سوپاســیان کــردمو هەوڵیان دا بڕێك پــارەم وەکو دیاری پێ بدەن، بەڵام من قبوڵم نەکرد..

پاشــان گەڕامەوە بۆ ماڵ، بینیم باوکمو دایکم بەو کارەم زۆر دڵخۆشــن، ئەوانیش سوپاســیان کردمو هانیان دام کە هەمیشە دەستپاكو ئەمینو ســەر ڕاست بمو ئەمانەتەکان بگێڕمەوە بۆ

خاوەنەکانیانو چاو نەبڕمە ماڵی هیچ کەسێك..

پاشان باوکم وتی: سوپرایزێکم بۆ تۆ هەیە کوڕی شیرینم، وتم چییە بابەگیان؟

دیارییەکی پێبەخشـیم.. کاتێـك دیارییەکەم کـردەوە بینیم سەعاتێکی زۆر جوانە، زۆر دڵم پێی خۆشبوو، چونکە ئەم سەعاتە هەر بەڕاسـتی هی خۆم بوو، پاشان زۆر سوپاسی باوکمم کردو وتم: بابەگیان تۆ وتت کاتێك دەرچوویت...، باوکم قسەکەی پێ بڕیمو وتی: کوڕی شیرینم، من پێشتر ئەم سەعاتەم بۆ کڕیبووی، بەڵام لای خۆم دامنابوو، تا ئەو کاتەی دەردەچیتو سـەرکەوتن بەدەست دەهێنیت، پاشان پێت ببەخشم، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ تۆ کردت، ئەوە سەرکەوتنی ڕاستەقینە بوو! لەبەرئەوە حەزم کرد لەمڕۆدا دیارییەکەت پێ بدەم!

پوختە:

✍ ئازیزانم، پێویسـتە هەمیشـە دەسـتپاكو ئەمین بین، دڵنیابیـن هەموو ئەو شـتانەی دەیاندۆزینەوە، خاوەنیان هەیە، پێویسـتە بە دوای خاوەنەکانیاندا بگەڕێین تا دەیان دۆزینەوە.

✍ دڵنیابن ئەگەر وازمان لە شـتێکی حەرام هێنا لەبەرخودا، خودا باشتر لەوەمان پێدەبەخشێت.

بەرخێکی زیرەك وریا بە تەنها لە دارستانێکدا دەژیا، ڕێویەکیش هەمـــوو ڕۆژێك پیلانی بـــۆ خواردنی دادەنا، بـــەڵام لەبەرئەوەی بەرخەکە زیرەك بوو، زۆر بە ئاســـانی خۆی لە پیلانەکانی ڕێوی فێڵباز دەپاراســـتو لە دەستی ناپاکی ڕێوی خۆی ڕزگار دەکرد..

لە ڕۆژێکی زســـتاندا بەرخەکە خـــەوی لێکەوتبوو، لەناکاو شریقەی هەورە تریشقەو لێزمەی باران وەخەبەر هات، بینی وا وردە وردە ئاو دزە دەکاتە نێو ماڵەکەی جێگەکەی تەڕ دەبێت، تا دێت بە هۆی بارانەکەوە ئاوەکە زیاد دەکات، بەپەلە هاتەدەرەوەی ماڵەکەی، بەڵام بە دیتنی بارانە بەخوڕو بە لێزمەکە هێندەی تر ترســـی لێنیشـــت، تا دەهات لافاوەکە زیادی دەکرد، ناچار هاواری کـــرد، فریام کەون، فریام کەون، خەریکە لە ئاوەکەدا دەخنکێم، تکایە هاوڕێیانی دارستان ئێوە لە کوێن، وەرن ڕزگارم بکەن!!

تا دەهـــات بارانەکە زیاتـــر دەبوو، لافاوەکـــەش زۆرتر دەبوو، هەرچەندە بەرخەکە بەلای ڕاستو چەپیدا دەیڕوانی، بەڵام هیچ کام لە هاوڕێکانی دارســـتانی بەدی نەدەکـــرد، دووبارە بە دەنگی بەرزتر هاواری کرد، فریام کەون، ڕزگارم بکەن، تکایە هاوڕێیان ئێوە لە کوێن؟ بۆ کوێ ڕۆیشتوون؟

لەو کاتە ناسکەدا ڕێوی فێڵباز گوێی لە هاوارو ناڵەی بەرخەکە

بوو، کــه داوای فریاکەوتنـــی دەکرد، دەســتبەجێ بیرۆکەیەکی ناحەزانەی بە مێشــکدا هــات، لەبەرخۆیەوە وتـــی: لە مێژبوو چاوەڕێی ئەم ڕۆژە بووم، ئەمە هەلێکی زێڕینە بۆ من هاتۆتە پێش، وا خۆم دەردەخەم کــە فریای دەکەوەمو لە خنکان ڕزگاری دەکەم، دواجار دەیکەمە ژەمە خۆراکی ئەمڕۆمو بە ئاواتەکەم دەگەم!

لەو کاتـــەدا ڕێوییەکە گــەڕا تا تەختە دارێکـــی دۆزییەوە، هاوکات لقێکی درەختی دۆزییەوەو چووە سەر تەختە دارەکەو لقە درەختەکەشـــی وەکو سەوڵ بەکاردەهێنا بۆ ڕۆیشتن لە نێو ئاوەکەدا، دەســـتی کرد بە ڕۆیشتن بە ئاراســـتەی ماڵی بەرخی لێقەوماو، هەر کە لێی نزیك بووەوە هاواری کرد هاوڕێ مەترسە، ئەوە من هاتووم تا ڕزگارت بکەم!

کاتێك بەرخەکە ڕێوییەکەی بینی، وا بەرەو ڕووی دێت، زانی کە کەوتۆتە نێو کێشـــەیەکی گەورەوە، کە لە بارانو لافاوەکە زۆر گەورەترە.

کاتێك ڕێوی فێڵباز زیاتر نزیك بووەوە لە بەرخەکە، بە دەنگی بەرز هاواری کرد، لە شـــوێنی خۆت بمێنەوە، مەجوڵێ تکایە، من هاتووم تا لە خنکان ڕزگارت بکەم، تکایە مەترسە، ئەوا هاتم بە فریاتەوە!

بەرخی زیرەك دەســـتی بەبیرکردنەوە کرد، بۆ ڕزگاربوون لە

ڕێوی فێڵبازو له مهترسـی لافاوهکهش، لـهو دهمهدا ڕێوییهکه گهیشـته لای بهرخهکه، دهستی بۆ درێژ کردو پێی گوت: دهستم بهرێ هاوڕێم، ئامادهم ڕزگارت بکهم!

بهرخهکه به ترسو لهرزهوه وتی: من دهترسم بخنکێم هاوڕێی ئازیز، چونکه ئـهو تهخته داره بهرگهی ههڵگرتنی دوو کهس ناگرێت..

سهرهتا لقه درهختهکهم بدهرێو تۆ دابهزه با من سهرکهوم، دوای من تۆ سـهرکهوه، ڕێوییهکه له خۆشی دهستکهوتنی بهرخهکه دهسـتبهجێ له تهختهدارهکه هاته خوارهوه، بهرخهکهش بازی ههڵدایه سهرتهخته دارهکهو به لقه دارهکه به خێرایی دهستی به سـهوڵ لێدان کرد، تا ئهو سـاتهی به تهواوی له ڕێوییهکه دوورکهوتهوه!

ڕێوییهکه له ئاسـت ئهم زیرهکییهی بهرخهکهدا پهشۆکابوو، تـا دواتر هاواری کرد، بۆ کوێ دهڕۆیت، من هاتم تۆ ڕزگار بکهم، بهڵام تۆ له نێو ئاوهکهدا منت جێهێشت؟

بهرخهکه به پێکهنینهوه وتی: زۆر سـوپاس ڕێوی ئازیز، تۆ منت له خنکان ڕزگار کرد، ههروهها له فێڵو کهڵبه تیژهکانیشت ڕزگارت کردم!

ڕێوییەکە هاواری کرد: ئەی کێ من ڕزگار بکات؟

بەرخەکـــە وتـــی: ئەو کاتەی مـــن لە تـــۆ دوورکەوتمەوە، پارچەتەختەکەت بۆ ڕەوانە دەکەمەوە!!

پوختە:

✍ منداڵە چاوگەشـــەکان، پێویستە هەمیشە زیرەکو وریابین، بەتایبەت لـــە کاتی تەنگانەدا، نابێت بە قســـەی بـــاقو بریقەداری کەسانی فێڵباز فریو بخۆین.

✍ دەبێـــت ئاگاداربین، ژیان خاڵی نییە لە ڕێوییە فێڵبازە دوو قاچەکان، بۆئەوەی نەبیتە قوربانی دەســـتیان، پێویستە زیرەکو وریا بیـــن، بەتایبەت لە کاتی ناخۆشـــیدا، چونکـــە فێڵبازەکان هەمیشـــە بەدوای هەلێکـــدا دەگەڕێن تا مەرامـــە گڵاوەکانیان جێبەجێ بکەن.

✍ لە یادت بێت، هەرگیز بێپرســـی دایەو بابە لەگەڵ هیچ کەســـدا بۆ دەرەوە مەڕۆ، ئەو کاتەی ئۆتۆمبێلێکی ئاخر مۆدێل لە بەردەمتدا وەســـتاو پێی وتی: فەرموو ســـەرکەوە با تەڕ نەبیت من هـــەر لەوێـــوە دەڕۆم، ئەتگەیەنم، تکایە بە قســـەی مەکەو ســـەرمەکەوە.. لەو کاتەدا ئەم چیرۆکە بهێنەرەوە بیری خۆت، ئەگەر بەرخەکە بەقسەی ڕێویەکەی بکردایە چی بەسەر دەهات؟!

مەریەمو ئەمیر خوشـــكو برا بوون، لـــە گوندێكی بچكۆلەو خنجیلانـــەدا لەگـــەڵ خێزانەكـــەی بە خۆشـــیو بەختەوەری ژیانیان دەگوزەراند، باوكیان هەر لە منداڵییەوە ڕۆژانە چیرۆكی پەروەردەییو سودبەخشی بۆ دەخوێندنەوە، ئەوانیش بەپەرۆشەوە گوێیان بۆ چیرۆكە خۆشەكانی بابە ڕادەدێراو زانیاری گەلی زۆری لێوە فێربببوون.

ژیانی گوند سادەوســاكار بوو، خەڵكی گونــد، هەندێكیان بە كشـــتوكاڵو هەندێكیان بە بەخێوكردنـــی مەڕومالاتەوە خەریك بوون..

ئەو ســاڵە زســتانێكی ســەخت بوو، بەفرو باران زۆر بوو، بەرەبەیانێكـــی زوو خەڵكـــی گونـــد لە دەنگی تریشـــقەو ناڵەی هەورو لێزمەی باران وەخەبەر هاتن، باران زۆر بە خوڕ دەباری، زەوییەكانیان لافاو دایپۆشیبوو، هەندێك لە ماڵەكان ئاویان تێچو بوو، بەشێوەیەك كە زۆر زەحمەت بوو بێنە دەرەوەو بە ڕێگەكەدا بڕۆن!

خەڵكی گوند هەمـــوو لەبەردەمی مزگەوتی گوند كۆبوونەوە، هەموو لە بیری ئەوەدا بوون كە ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە، هەر یەكەو پێشنیارێكی دەكرد، بۆئەوەی بتوانن بە ڕێگەكەدا بپەڕنەوەو

بتوانـــن لە ماڵ بێنە دەرەوەو لە ئاوی ئەو لافاوە ڕزگاریان ببێتو دووچاری زیان نەبن!

دواجـــار ڕێکەوتن لەســـەر ئەوەی پردێك دروســـت بکەن، تا بەهۆیەوە بتوانن لە شـــیوەکەی بەردەمی گوند بپەڕنەوەو بتوانن بچنە ســـەر شـــەقامە گشـــتییەکە.. بەڵام لە نـــاکاو دوو منداڵ وەدەرکەوتن، مەریەمو ئەمیر، ڕەخنەیان لەو پێشنیارەی خەڵکی گوند گـــرتو وتیان: ئەی بۆچی لە بری ئەوەی پردێك دروســـت بکەین، بۆچی کارێك نەکەین سوود لە ئاوی بارانەکە وەربگرین؟

خەڵکەکە وتیان: پێشنیارێکی جوانە بەڵام چۆن؟

دوو منداڵەکـــە، واتە مەریـــەمو ئەمیر وتیان: بـــا خەزانێك دروســـت بکەین، تا ئـــاوی باراناوەکە بچێتە ئـــەو خەزانەوە، تا پڕ دەبێت، دواتر ســـوودی لێ دەبینینو لە کاتی پێویستدا بەکاری دەهێنین!

خەڵکەکـــە وتیان: بەڵام خۆ ئاوی باراناو بەکەڵکی خواردنەوە نایەت!

منداڵەکان وتیـــان: بەڵام دەتوانین بۆ کشـــتوکاڵکردن بەکاری بهێنین، بۆ زۆر بواری تر بەکاردێت، جگە لە خواردنو خواردنەوە.

خەڵکی گوند هەموو سوپاســـی ئەو دوو منداڵە ژیرەیان کرد،

لەسەر ئەو پێشنیارە جوانەیان، هەمووان بە زیرەکیو لێهاتوویو شارەزایی ئەو دوو منداڵە سەرسام بوون، بەشێوەیەك لەو ڕۆژە بەدواوە، بۆ هەموو کاروبارێکی گوند ڕاوێژیان پێ دەکردن..

پوختە:

✍ منداڵە خۆشەویستەکان.. خوێندنەوەو گرنگی دان بە کتێب، مرۆڤ شارەزاو بەهرەمەند دەکاتو دەبێتە کەسێکی بەسوود بۆ خۆیو بۆ دەوروبەرەکەی، کەواتە هەرگیز خوێندنەوە فەرامۆش مەکەو بەردەوام گرنگی پێ بدەو ڕۆژانە کاتی تایبەتی بۆ دابنێ.

✍ لە کۆنەوە وتویانە ژیری بە گەورەییو بچوکی نییە، هەر کەس بیربکاتەوەو خەیاڵی فراوان بێت، پێدەچێت ڕاوبۆچوونەکەی وەربگیرێت، ئەگەرچی منداڵو کەم تەمەنیش بێت.

✍ چیرۆك گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، بیرو خەیاڵی مرۆڤ فراوان دەکاتو ئاسۆی ڕوونترو گەشاوەتر دەکات!

پادشـــایەك هەبوو، خاوەنی هەموو شتێك بوو، خاوەنی كۆشكو تەلاری بـــەرز، خزمەتگـــوزارو گەوهـــەرو مرواری، ســـەربازو ســـەروەتو سامانی زۆر، هەموو پێداویستییەكی ژیانو گوزەران، لەگەڵ هەموو ئەمانەشـــدا، بەردەوام خەمبار بوو، هەرچی دەكرد نەیدەتوانی بەختـــەوەر بێت، زۆر گەڕا، حەكیم نەما ســـەردانی نەكات، شـــارەزا نەما پرسو ڕاوێژی پـــێ نەكات، بەڵام نەیدەتوانی بەختەوەری بەدەست بێنێت..

لەبەرئـــەوە بڕیاری دا دەســـتێك جلی ڕێبوارانـــە لەبەر بكاتو بڕوات بە نێـــو خەڵكیدا بگەڕێت، تا بەختـــەوەران بدۆزێتەوەو لە نهێنـــی بەختەوەرییان تێبگاتو هەوڵ بدات لەوانەوە فێربێت چۆن بەختەوەر ببێت!!

لە سەرەتای دەستپێكردنی گەشتەكەیدا، ڕێگەی كەوتە گوندێك، ماڵێكی ســـادە سەرنجی ڕاكێشا، بەرەو ماڵەكە ڕێگەی گرتەبەر، تا بـــە تەواوی لێی نزیك بووەوە، بینی وا كابرایەكی هەژار بە تەنها دانیشـــتووەو نان دەخواتو لەبەرخۆیەوە گۆرانی دەڵێت، هەستی كرد كەسێكی زۆر دڵخۆشە، بە ڕووخسارییەوە هیچ خەمێك بەدی نەدەكرا!

پادشا لە دەرگای داو مۆڵەتی چوونە ژووری خواست..

خاوەن ماڵ پرسی: فەرموو بەڕێزتان کێین، لە ڕێبوار ئەچن؟
پادشا وتی: ڕێبوارم.

پیاوە هەژارەکە وتی: بەخێرهاتی سەرچاوانم، فەرموو تەشریف بهێنە ژوورەوە، خاوەن ماڵ زۆر ڕێزی لە کاکی ڕێبوار گرتو نانی بۆ ئامادەکردو بە خولقێکی گەرمەوە پێشکەشی کرد. خواردنەکەشیان پەنیرو نان بوو.

پادشا وتی: دەتوانم لە لای تۆ بمێنمەوە تا کاروانەکە دەگاتو ئەو شتەی دەمەوێت لێیان دەکڕمو پاشان دەگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم؟!

پیاوە هەژارەکە وتی: زۆر بەخۆشحاڵییەوە ماڵی خۆتە، هەرچەندێک دەتەوێت لای من بمێنەرەوە ماڵی خۆتە، من لێرەدا بە تەنهام، وابزانە لە ماڵی خۆتانی.

پادشا زۆر سەری سوڕما لەم هەژارە، هەژارێك خاوەنی هیچ شتێك نییە، بەڵام لێوان لێوە لە بەختەوەری، بەو شێوەیە ڕێز لە میوانەکەی دەگرێتو بەو گەرمییە پێشوازی لێ دەکات!

پادشا وتی: لەگەڵ تۆدا دەژیم، تا منیش وەکو تۆ بەختەوەر بم!

پادشا لەو ڕۆژە بەدواوە لەگەڵ ئەو کابرا هەژارەداو لە نێو ئەو خانووە سادەیەدا دەژیا، بەیانیان زوو لە خەو هەڵدەستا،

لەگەڵ خاوەنماڵەکە دەڕۆیشتە سەر کارو تا خۆراوابوون، کاری دەکردو پاشان دەگەڕانەوە ماڵو پێکەوە نانێکی سادەیان دەخواردو سوپاسی خودایان لەسەر دەکردو شەو زوو دەنووستن.

بە درێژایی یەك هەفتە پادشا بەمجۆرە ژیانی گوزەراند، هیچ شتێکی تازەی بەدی نەکرد، هەر ئەوەبوو ڕۆژانە دووبارە دەبووەوە، شەوێکیان پادشا بە خاوەن ماڵە هەژارە بەختەوەرەکەی گوت: سبەی من دەگەڕێمەوە بۆ شارەکەی خۆم، دەمەوێت کرێی مانەوەی ئەم هەفتەیەت پێ بدەم، کە بوومەتە ئەرکو ماندووبوون بۆ بەڕێزتان؟

پیاوە هەژارەکە گوتی: بۆچی ئێوە لە شارەکەی خۆتان، کرێ وەردەگرن لەبەرامبەر خزمەتکردنی میوانەکانتان؟

پادشا وتی: نەخێر، بەڵام من هەستەکەم بەڕێزتان کەم دەرامەتو هەژارن، پێویستتان بە پارەو سامان هەیە..

پیاوە هەژارەکە وتی: خودا ڕۆزیمان دەدات، بێ خەمبە، من جگە لە خودا داوای ڕۆزی لە کەس ناکەم!

پادشا وتی: پێش ئەوەی بڕۆم، دەمەوێت نهێنی بەختەوەریو ڕەزامەندیتم پێ بڵێی!

پیاوە هەژارەکە وتی: خودا تەندروستیو لەشساغی باشی

پێبەخشیومو هیچ نەخۆشییەکم نییە، ڕۆزی پێ بەخشیوم، کە پێی دەژیمو پێویستم بە کەس نییەو لە کەس داوای یارمەتی ناکەم، ویژدانم ئاسوودەیە، چونکە ستەمم لە هیچ کەس نەکردووە کەسیش ستەمی لێ نەکردووم، ئازاری کەسم نەداوەو کەسیش ئازاری نەداوم، هەمیشە سوپاسی خودا دەکەم لەسەر بەخششەکانی، ئایا هەموو ئەمانە بەس نییە کە من کەسێکی بەختەوەر بم؟

پوختە:

- بەختەوەری بە پارەو سامانو پلەو پایەو دەسەڵات نییە، زۆر دەبینین هەژارەکان زۆر دڵخۆشترە لە دەوڵەمەندەکان!
- قەناعەت گەنجینەیەکی لە بن نەهاتووەو سەرچاوەی بەختەوەری مرۆڤە.
- ئەگەر ویستت بەختەوەر بیت، هەمیشە بڕوانە بۆ کەسانی خوار خۆت، هیچ کات سەیری کەسانی لە خۆت بەرزتر مەکە.

سایە منداڵێکی جوانکیلەو ژیرو زیرەكو هۆشمەند بوو، گوێڕایەڵی دایكو باوکی بوو، هەرچی ئەوان پێیان بوتایە ئەنجامی دەداو هەرچی ئەوانیش ڕقیان لێبووایە لێی دووردەکەوتەوە، ئەو هەمیشە حەزی دەکرد ئەو کارانە بکات کە دایكو باوکی پێیان خۆشە، سایە بە ڕەفتارە جوانو قسە نەستەقەکانی لە نێو دڵی هەمواندا جێگەی خۆی کردبووەوە، هەمووان زۆریان خۆش دەویست، بە جۆرێك کە خۆشەویستییەکەی ناوازە بوو، جیاواز لە منداڵەکانی دیکە بوو، بەڵام سایە یەك گرفتی هەبوو، ئەویش ئەوەبوو حەزی بە شیر نەدەکردو بە هیچ شێوەیەك نەیدەخواردەوە، تەنها شیر نا، بەڵکو هیچ بەروبومو بەرهەمێکی شیری نەدەخوارد.. هەرچەندە جاروبار زۆری لە خۆی دەکردتا پارووییەك ماست بخوات، بەڵام دواجار نەیدەتوانی قوتی بداتو فڕێی دەدایەوە..

ڕۆژێکیان دایکی سایە هەست دەکات، کە ڕووخساری سایە کەمێك زەرد هەڵگەڕاوەو ڕووخساری ئاسایی نییە..

بۆ ڕۆژی دواتر سایە هەست بە ئازارێك دەکات لە قاچەکانیدا، دەچێتە لای دایکیو دەڵێت: دایەگیان قاچەکانم ئازاری هەیە، دایکی پێی دەڵێت: کچە شیرینەکەم ئەوە هۆکاری ئەوەیە کە تۆ شیر ناخۆیتەوە، نەك هەر ئەوەش بەڵکو هیچ بەرهەمێکی شیر ناخۆیتەوە!

سایە زۆر گرنگی بە قسەی دایکی نەدا، چونکە وایزانی دایکی دەیەوێت لەو ڕێگەیەوە ناچاری بکات کە شـــیرو بەرهەمەکانی بخوات، هەرچەندە سایە زۆر گوێڕایەڵی دایكو باوکی بوو، بەڵام بۆ شـــیرو بەرهەمەکانی نەیدەتوانی بە قســـەیان بکاتو دەیگوت بۆم ناخورێت، زۆرجاریش تاقی دەکردەوە بۆی قوت نەدەچوو!

ڕۆژێکیان ســـایە لە نێو باخچەی ماڵەکـــەدا لەگەڵ منداڵەکانی دیکە یارییان دەکرد، لەناکاو سایە کەوتە سەرزەوی، باوکی کە ئەو کات گەڕابووەوە ماڵ، بینی ســـایە کەوتووە، بەپەلە هەڵی گرتەوە بردی بۆ نەخۆشخانە، پزیشکەکان بە وردی پشکنینیان بۆکرد، هەر شتێك پێویستی بوو بۆیان ئەنجامدا، دواجار یەکێك لە پزیشکەکان ڕووی کردە سایەو گوتی: کچە جوانەکە تۆ شیر دەخۆیتەوە؟

سایە سەری داخستو بە شەرمەوە گوتی: نەخێر.. حەزم لە شیر نییەو ناتوانم بیخۆمەوە.

پزیشکێکی دیکە گوتی: باشە پەنیریش ناخۆیت؟

سایە دووبارە وتی: نەخێر، ناتوانم هیچ بەرهەمێکی شیر بخۆم..

پزیشـــکەکان بەسەر سامییەوە ســـەیرێکیان کردو وتیان: ئایا دەزانیـــت لە ئەنجامی ئەوەی شـــیرو بەرهەمەکانی ناخۆیت چی بەسەر جەستەتدا هاتووە؟

سایە وتی: نەخێر نازانم چیم بەسەرهاتووە؟

پزیشکەکان پێیان گوت: ددانەکانت تەواو لاواز بوون، هەروەها ئێسکەکانیشت بە تەواوی لاوازبوون، پێویستت بە چارەسەرێکی زۆر هەیە، چونکە تۆ شیرو بەرهەمەکانت نەخواردووە، نەقسێکی زۆری ئەو ڤیتامانە دروســـت بووە لە جەســـتەتدا کە لە شیرو بەرهەمەکانیدا هەیە، لەبەرئەوەی شیرو بەرهەمەکانی زۆر بە سوودن بۆ جەستەی مرۆڤ، ئێسك‌و ددانی مرۆڤ بەهێز دەکەن، ئەگـــەر مرۆڤ شـــیرو بەرهەمەکانی نەخوات، ئـــەوا دووچاری لاوازی ئێسك‌و ددانەکانی دەبێت!

لەبەرئەوە ســـایە گوڵ تۆ دەبێت بۆ ماوەی یەك هەفتە زۆر بە چڕی ئەو دەرمانانەی بۆت دەنووســـین بەکاریان بهێنیت، جگە لە حەبەکان دەبێت بەیانیان دەرزییەك‌و ئێوارانیش دەرزییەك بکەیت، واتە ڕۆژی دوو دەرزی!

سایە بە بیستنی ئەم قسانە دەستی کردە گریان، فرمێسکەکانی چاوی وەك بارانی بەهار هەڵدەوەرین، ئەوەندە بە خەمباری دەگریا، باوکیشـــی هێنایە گریان، پاشان وتی: من ڕقم لە دەرزییە ئەترسم تکایە من دەرزی ناکەم!

پزیشکەکان وتیان: کچەکەم گریان سوودی نییە، ئێستا تۆ ئێسك‌و ددانەکانت  بە تەواوی لاوازبوون، دەبێت لایەکیان هەڵبژێری، یان دەبێت ڕۆژانە دوو دەرزی بکەیت، یان دەبێت ڕۆژانە شیرو پەنیرو

ماستو کەرەو خامە بخۆیت، ئەگەر هیچیان نەکەیت ددانەکانت ماوەیەکـــی دیکە دوور نییە هەڵبوەرن، ئێســـکەکانت زیاتر لاواز دەبن، ئەو کات پێویستت بە دەرزی زیاتر دەبێت!

دووبارە ســـایە دەســـتی کردەوە بـــە گریانو وتی نـــا.. نابێت دەرزی زیاتـــرم لێبدەن، من ڕقم لـــە دەرزییە، دەرزی ئازارم دەدات، بەڵێن ئەدەم لەمڕۆ بەدواوە شـــیر بخۆمـــەوە، هەروەها هەموو بەرهەمەکانی شیریش بخۆم..

ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە سایە فێری خواردنی شیرو بەرهەمەکانی بوو، هێواش هێواش چاك بوومەوو ڕووخســـاری ئاسایی بوویەوەو ئێسكو ددانەکانی پتەو بوون!

پوختە:

✍ منداڵـــە چاوگەشـــەکان، هەرگیزشـــیرو بەرهەمەکانـــی فەرامۆش مەکەن، چونکە زۆربەسوودە بۆ جەستەی مرۆڤ.

✍ تکایە لە هیچ شتێکدا ســـەرپێچی فەرمانی دایكو باوکتان مەکەن، چونکە هەمیشـــە ئەوان دڵســـۆزترین کەســـن بۆ ئێوە، ئەوەی پێتان دەڵێن: لە پێناوی بەرژەوەندی ئێوەیە.

✍ ڕاســـتە دەرمان تاڵە، بەڵام لە کاتی ناچاریدا دەبێت بەکاری بهێنین، بۆئەوەی بە ویستی خودا بە زوویی چاك ببیتەوە!

پادشـــای شـــار تەمەنی چـــوو بووە ســـەر، ڕۆژ بـــە ڕۆژ باری تەندروستی خراپتر دەبوو، ڕۆژێکیان کوڕە گەورەکەی بانگهێشت دەکاتو پێی دەڵێت: کوڕی شیرینم خۆت دەزانیت من بەساڵاچووەو تەمەنم چووەتەسەر، ساڵانێکە لە خزمەتی ئەم گەلو نیشتمانەدا ژیان دەگوزەرێنم، ئێستاش لەوە زیاتر تاقەتو حەوسەڵەم نەماوە، نەخۆشی هەراسانی کردووەمو پیری ئارامی لێ بڕیوم، چیدی ناتوانم کورسی دەسەڵات بەڕێوە ببەم، بۆ ئەم مەبەستە دەمەوێت لەمەودوا، تۆ ببیتە پادشاو ئازایانەو خۆنەویستانە کاروباری وڵاتەکەم بەڕێوە ببەیت، لە ئەمڕۆوە تۆ وەکو پاشای وڵات دەناسێنم..

بۆ ڕۆژی دواتر ئاهەنگی بوون بە پادشای کوڕە گەورەی بەڕێوە چوو، لەو ڕۆژەوە کوڕەکەی بووە پادشاو خەڵکی لە هەموو لایەکی شارەوە بۆ پیرۆزبایی دەهاتنە لای جەنابی پادشا..

پادشای نوێ دەستەیەکی نوێی بۆ بەڕێوەبردنی وڵات هەڵبژاردو ســـەرجەم وەزیرەکانی پێشـــووی گۆڕیو کەســـانی تـــازەی کردە وەزیری وڵاتەکەی، ڕۆژێك لـــە کۆبوونەوەی لەگەڵ وەزیرەکاندا وتی: دەمەوێت پزیشـــکێکی تایبەتمان هەبێت بۆ کۆشك، چونکە خۆتان دەزانن باوکم تەندروســـتی ناجێگیرەو تەمەنیشی چووەتە سەر، پێویستی بە چاودێری بەردەوام هەیە!

جەنابی پادشـــا، بۆ دیاریکردنی پزیشـــکێکی لێهاتوو. سەرسامو دەستەوەســـتان بوو، چونکە ئەو دەیویست پزیشکەکەی کۆشك، جگە لەوەی پزیشـــکێکی لێهاتوو بێت، هاوکات ئەمینو دەستپاكو دڵسۆز بێت، بۆئەوەی بەردەوام چاودێری تەندروستی باوکم بکات!

پادشا لەم خەیاڵو بیرکردنەوەدا بوو، کەسی وەهای بەدی نەکرد، کە لە ئاســـت داواکاری ئەودا بێت، ناچار پرســـیاری لە یەکێك لە وەزیرە بە ئەزمونەکانی کردو وتی: باشـــترین پزیشـــکەکانی شار کێن؟

وەزیرەکەی لە وەڵامدا وتی: باشترین پزیشکی شار سێ پزیشکن.

پادشا وتی: بنێرە بە شوێنیاندا با هەر ڕۆژەی پزیشکێك لەو سێ پزیشکە سەردانمان بکاتو پشکنین بۆ باوکم ئەنجام بدات.

ڕۆژی یەکەم، پزیشـــکی یەکەم گەیشتە کۆشكو بە سەرجەم پێداویستییە پزیشـــکەکانییەوە، وەزیر پێی ڕاگەیاند کە جەنابی پادشا ئازارێك لە گەدەیدا هەیە، تکایە چارەسەرێکی بۆ بدۆزەرەوە؟

پزیشکەکە پشکنینی بۆ پادشـــا ئەنجام داو پێی گوت: هەندێك دەرمانـــت بۆ دەنووســـم، بەکاریـــان بهێنە بە ویســـتی خودا چاك دەبیتەوە!

ڕۆژی دووەم پزیشـــکی دووەم هاتە کۆشكو ئەویش پشکنینی

بۆ پادشـــا ئەنجام داو پاشـــان پێی وت: جەنابی پادشا، چارەسەری ئـــەم دەردەی بەڕێزتان لە گوڵێکـــدا هەیە، کە لەم وڵاتەی ئێمەدا نییە، بـــەڵام دەتوانم بڕۆم بۆ فلان وڵاتو لەوێ بۆی پەیدا بکەمو بیهێنمەوە بۆ بەڕێزتان، بە ئومێدی ئەوەی بە تەواوی لەو ئازارە ڕزگارتان بێت!

پادشـــاش پێی گوت: زۆرباشـــە ئامادەکاری بۆ بکەن، با بڕوات بۆمان پەیدا بکات لە هەر کوێیەك هەیە.

بۆ ڕۆژی ســـێیەم، پزیشکی سێیەم هات: ئەویش دەستی کرد بە پشکنینی جەنابی پادشا، بێئەوەی بزانێت کە پێشتر پزیشکی دیکە پشکنینیان بۆ پادشا کردووە، پزیشکەکە پێی گوت: جەنابی پادشا تۆ هیچ شتێکت نییە، تەندروستیشت زۆر باشە، سوپاس بۆ خودا!

پادشا وتی: چۆن هیچم نییە مەگەر من پێت ناڵێم گەدەم ئازاری هەیە؟!

پزیشـــکەکە وتی: ڕەنگـــە خواردنێکی چـــەورت خواردبێت، تەنها پێویســـتت بە کەمێك وەرزشـــکردنە، بەڵام دڵنیابە تۆ هیچ نەخۆشییەکت نییە.

جەنابی پادشـــا زۆر سوپاســـی کردو وتی: لـــە ئەمڕۆ بەدواوە تۆ پزیشـــکی کۆشـــکی، چونکە کەســـێکی ئەمینو ئازاو بوێری،

توانیت ڕاســـتییەکەم پێ بڵێیت.. لە ڕاســـتیدا هەروایە من هیچ نەخۆشـــییەکم نییە، بەڵام پزیشـــکەکانی پێش تـــۆ نەیان دەوێرا بڵێن، تۆ نەخۆش نیت، هەر یەکەو دەرمانێکی بۆ نووسیم.. لەبەر ئەمانەتو ڕاســـتگۆیی‌و حەق بێژیو لێهاتوویت تۆ بە پزیشـــکی کۆشك هەڵدەبژێرین..

پوختە:

- پێویســـتە مـــرۆڤ چاونەترس‌و ئازاو بوێـــر بێت، لە وتنی حەق هەرگیز سڵ نەکاتەوەو نەترسێت.
- پێویستە مرۆڤ ڕاستگۆ بێت، بۆ ڕەزامەندی کەسی بەرامبەر هەوڵ نەدات ناڕاستی بڵێت.
- ئەگـــەر بوویتە پزیشـــك بـــە وریاییـــەوە مامەڵە لەگەڵ نەخۆشـــەکانتدا بکە، چونکە ژیانی ئەوان ئەمانەتە لەبەردەستی تۆدا.

جەلال منداڵێکی تەمەن ٨ ســاڵان بوو، زۆر حەزی لە خواردن بوو، کورد وتەنی نەوســن بــوو، هەروەها زۆریشــی دەخوارد، هەمیشە سکی پڕبوو، هەر خواردنێکی ببینیایە تێری لێ دەخوارد، ورگی وەکو کاڵەکی لێهاتبوو، خرپنو قەڵەو بوو، بەشێوەیەك بە نارەحەتی دەیتوانی بە ڕێگەدا بڕوات، گرنگی بە تەندروستی خۆی نەدەدا..

کاتێك دەڕۆیشــت بــۆ قوتابخانــەش جانتاکەی پــڕ دەکرد لە شــیرینیو لەفەو خواردن، لە هەر پشوویەکی نێوان وانەکاندا شتێکی دەخوارد، ڕۆژێکیان وانەی وەرزش بوو، قوتابییەکان هەموو ڕۆیشــتن بۆ گۆڕەپانی قوتابخانە، مامۆستای وەرزش وتی: ئەمڕۆ پێشــبڕکێ دەکەین، بۆئەوەی بزانین کێ لــە هەمووان خێراترە، کەسی براوە خەڵات ئەکەم، تۆپێکی جوانی پێ دەبەخشم!

قوتابییــەکان بــە یارییەکــەو دیارییەکە زۆر دڵخۆشــبوون، هەمــووان لە هەوڵی ئــەوەدا بوون، کە پلەی یەکەم بەدەســت بهێننو دیارییەکە وەربگرنو ببنە براوەی یەکەم، یارییەکە دەستی پێکرد، دەبوا هەر قوتابییەك ٥ جار بە دەوری گۆڕەپانی قوتابخانەدا ڕای بکردایە، مامۆســتا فیکەی دەرچوونی لێدا، قوتابییەکان ڕایان کرد، مامۆســتاش چاودێری دەکردن، تێبینی کرد جەلال زۆر خاوە

له ڕاکردناو توانای ڕاکردنی نییه، تەنانەت توانای یەك جاریشی نەبوو بەدەوری گۆڕەپانی قوتابخانەدا بسوڕێتەوە، دواجار له ماندویتیو هەناسه برکێدا کەوته سەر زەوی، ڕووخساری سوور هەلگەڕابوو، عارەق تك تك به ناوچەوانیدا دەهاته خوار، هاوڕێکانی پێی پێ دەکەنین..

مامۆستا ڕۆیشت بۆ لایو هەڵی ساندەوەو پێی وت: جەلال تۆ زۆر دەخۆیت، ناتوانیت ڕابکەیتو به نارەحەت دەتوانیت بڕۆی به ڕێگەدا.. پێویسته کێشی خۆت کەم بکەیتەوە، ئەگەرنا دووچاری زۆر نەخۆشی دەبیت.

پاشان وتی: وەرە بابڕۆین بۆ لای پزیشکی قوتابخانه، مامۆستا بابەتەکەی بۆ پزیشکەکه ڕوونکردەوە، پزیشکەکه وتی: جەلال پێویسته سەرەتا خواردن کەم بکەیتەوە، هەروەها خشتەیەکی خواردنی بۆ داناو پێی وت کە ڕێنماییەکان جێبەجێ بکات، هەروەها دەبێت گرنگی به وەرزشکردن بدەیت.

مامۆستا وتی: جەلال خۆم چاودێریت دەکەم، هەروەها ڕۆژانه دەبێت بێیت بۆ ژووری وەرزشکردن، له کاتی پشووەکاندا.

بۆ ڕۆژی دواتر جەلال ڕۆیشت بۆ قوتابخانه، بەلام بڕێکی زۆر کەمی خواردن لەگەڵ خۆیدا برد، هەروەها له کاتی پشووەکاندا

دەڕۆیشت بۆ ژووری وەرزشەکەو وەرزشی دەکرد، مامۆستاش فێری زۆر یاری وەرزشی کرد کە یارمەتی دابەزینی کێشی لەش دەدەن، جەلال لەسەر ئەم بەرنامەیە بەردەوام بوو، لەو ڕۆژە بە دواوە زیادەخۆری نەدەکردن بە بەردەوامیش وەرزشی دەکرد، بە هاوکاری مامۆستاکەی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کێشی کەمی دەکرد، ئێستا بە ئاسانی دەتوانێت بە ڕێگەدا بڕوات.

جەلال بەردەوام بوو لەسەر وەرزشکردن، دوای دوو مانگ لە وەرزشو زیادەڕەوی نەکردن لە خواردن، جەستەو لەشو لاری وەکو هاوڕێکانی لێهات، ئیدی وەکو هاوڕێکانی دەیتوانی ڕابکات، وەرزش بکات، یاری تۆپی پێ بکات.. جەستەیەکی خۆشو تەندروستی هەبوو، زۆر هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد، کەس گاڵتەی پێ نەدەکرد، لە ڕێگە هەناسەبڕکێی پێ نەدەکەوت، هەوڵی بەدەستهێنانی پلەی یەکەمی دەدا لە ڕاکردنەکاندا.

ڕۆژێك ڕۆیشت بۆ ژووری مامۆستای وەرزشو زۆر سوپاسی هەوڵو هاوکاریو یارمەتییەکانی کرد، پێی گوت: وانەیەکت فێرکردم کە هەرگیز لە یادی ناکەم، تێگەیشتم کە لەشو لارێکی ڕێكو پێكو شیك بە وەرزشکردن بەدەست دێت، نەك بە زۆر خواردن.

مامۆســـتاکەی پێی گوت: جەلال تـــۆ قوتابییەکی گورجو گۆڵو چالاکیـــت، خاوەنی هیـــواو ئاواتی زۆرو خۆڕاگرییەکی باشـــیت، بەردەوامبە تا ئەو کاتەی دەبیت بەو کەسەی کە خۆت دەتەوێت.

پوختە:

✍ نابێت زیاتر لە پێویســـت بخۆیـــن، چونکە خواردنی زۆر قەڵەومـــان دەکات، قەڵەویش چەندەها نەخۆشـــی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

✍ وەرزشکردن زۆر پێویســـتە بۆ مرۆڤ، ئەگەر دەتەوێت جەستەیەکی پتەوو بەهێزت هەبێت، پێویستە وەرزش فەرامۆش نەکەیت، ڕۆژانە کات تەرخان بکە بۆ وەرزشکردن.

✍ قوتابی ژیر، هەمیشـــە گوێڕایەڵی ئامۆژگاری مامۆســـتاو پزیشكو دایكو باوكو کەسانی لەخۆی گەورەتر دەبێت.

سوهام کچێکی ژیرو هۆشمەند بوو، زۆر حەزی بە چیرۆکەکانی دایەو بابەی دەکرد، هەر کات باوکی لەسەر کار دەگەڕایەوە، پێش ئەوەی ماندوویتی دەربچێتو عارەقەی نێوچەوانی وشك بێتەوە، دەڕۆیشـــتە لایو پاش بەخێرهاتنەوەی پەرداخێك ئاوی پێشکەش دەکردو دەیگوت: بابە گیان، من حەزم لە چیرۆکە تکایە چیرۆکێکی دیکەم بۆ بگێڕەوە.. باوکیشی هەرچەندە زۆر ماندووبوو، هێشتا پشـــووی نەدابوو، بەڵام دڵی نەدەهات دڵی کیژۆڵەکەی بشکێنێت، ناچار چیرۆکێکی بۆ دەگێڕایەوە..

پاشـــان دەڕۆیشـــت بۆ لای دایکیو هەر کات دڵنیابووایە کە لە کاروباری ناوماڵ تەواو بووەو بە نیازە کەمێك پشوو بدات، دیسان سوهام دەڕۆیشتە نێو باوەشی دایکی ئەزیزیو ماچێکی ڕووخساری دەکـــردو دەیگوت: دایە گیان دەزانـــم ماندووی بەڵام من حەزم لە چیرۆکە، تکایە دڵم مەشـــکێنەو چیرۆکێکی خۆشم بۆ بگێڕەوە. دایکیشی هەرچەندە ماندوو بوو، بەڵام هەرگیز دڵی نەدەهات دڵی جگەر گۆشەکەی بشکێنێت، ناچار ئەویش چیرۆکێکی خۆشی بۆ کیژۆڵە نازدارەکەی دەگێڕایەوە..

ئەمە پیشـــەی هەموو ڕۆژێکی ســـوهام خانم بوو، هیچ کات لە بیستنی چیرۆکەکان بێتاقەت نەدەبوو، زۆر حەزی بە چیرۆکەکانی

دایەو بابەی دەکرد، هەمیشـــە حەزی دەکرد ئەویش وەك پاڵەوانی چیرۆکەکان ڕۆڵ ببینێت، بەڵام گوێی بە ماندووبوونو شەکەتی دایـــكو باوکی نەدەدا، لەبەرئەوە باوکی بەردەوام بیری دەکردەوە، لەبەرخۆیـــەوە دەیگوت: کچەکەم زۆر حـــەز بە چیرۆك دەکات، منیش چیرۆکی زۆرم بۆ گێڕاوەتەوە، بە جۆرێك کە جاری واهەیە چیرۆکـــەکان دووبـــارەن کە بۆی دەگێڕمەوە، باشـــە ڕێگە چارە چییە؟

ڕۆژێکیـــان باوکـــی بەرامبەر تەلەفزیۆن دانیشـــتبوو، لەناکاو هەستایە سەرپێو وتی: دۆزیمەوە، لە کۆتاییدا دۆزیمەوە!

دوای چەند ڕۆژێك پێشانگای کتێبی نێودەوڵەتی لە شارەکەیان کرایەوە، باوکی سوهامو دایکیو سوهام خانم، پێکەوە ڕۆیشتن بۆ ئەو پێشانگایە، چەندین کتێبی ناوازەی چیرۆکیان بۆ کچەکەیان کڕی، کە چیرۆکە جیهانییەکانی لە خۆگرتبوو، هەروەها چەندین یاری فێرکاریشـــیان بۆ کڕی، لەگەڵ چەند کتێبێکی فێرکاری کە لەگەڵ تەمەنیدا دەگونجا!

پاشان گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، سوهام لە خۆشیدا وەخت بوو باڵ بگرێت، ئەو ڕۆژە زۆر دڵخۆش بوو، چونکە ئیدی پێویســـتی بەوە نەما ببێتە ئەرك بۆ دایكو باوکی، تکایان لێ بکات تا چیرۆکێکی بۆ

بگێڕنەوە، بەڵکو ئێستا لە کتێبەکانیدا خاوەنی چەندەها چیرۆکی جیهانییە، ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە سوهام بەردەوام، یان چیرۆکی دەخوێندەوە، یان بە یارییە فێرکارییەکانەوە سەرقاڵ بوو، یاخود بە کتێبە فێرکارییەکانەوە!

دوای ماوەیەك ڕۆژێکیان باوکی سوهام لەسەر کار گەڕایەوە، سوهام بەپەلە ڕۆیشت بۆ پێشوازی باوکیو بەخێرهاتنی کردەوەو پێی گوت: بابەگیان..

باوکی گوتی: بەڵێ کچی شیرینم، ئەوە ماوەیەکە نابینم بەشێوەی جاران کە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵ بێیت بە پیرمەوەو بەخێرهاتنەوەم بکەیتو بانگم بکەیت؟

سوهام وتی: بابەگیان زۆر سوپاست دەکەم، بۆ ئەو پەرتووکە بە نرخانەی پێشکەشت کردم، ئێستا خۆم چیرۆکەکان دەخوێنمەوە، چیدی نابمە ئەرك بۆ ئێوە، ئێستا گوێ بگرە با من ئەم چیرۆکە خۆشەت بۆ بگێڕمەوە.. سەرەتا باوکی لەبەر دڵی کچەکەی زۆر بە جوانی گوێی بۆ ڕادێرا، تا تەواو بوو..

دواتر باوکی دەستی کرد بە پێکەنینو زۆر دڵخۆش بوو، وتی: ئێستا کچەکەی من بووەتە خاوەنی گەنجینەیەك لە چیرۆك، دەیەوێت ئەو چیرۆکیان بۆ بگێڕێتەوەو جارێکی دیکە چێژیان

لێوەربگرێت، واتە جارێك چێژ وەربگرێت بەهۆی ئەوەی دەیخوێنێتەوە، جارێکی دیکەش بەهۆی ئەوەی بیگێڕێتەوە بۆ دایكو باوکی چێژی لێ وەربگرێت، ئێستا سوهام دەیەوێت چیرۆك بگێڕێتەوە، لەبری ئەوەی گوێ بۆ گێڕانەوەی چیرۆك بگرێت. بەڵام کەسی دەستناکەوێت بۆی بگێڕێتەوە ناچار بۆ دایكو باوکی دەگێڕێتەوە..

پوختە:

- ئەگەر دەزانیت دایكو باوکت کاتیان نییەو ناتوانن چیرۆکت بۆ بگێڕنەوە، ئەوا داوایان لێ بکە، کتێبی چیرۆکت بۆ بکڕن، تا خۆت ڕۆژانە چیرۆکەکان بخوێنیتەوەو سودیان لێ ببینیت.
- کاتێك چیرۆکێك دەخوێنیتەوە هەوڵ بدە بیگێڕەوە بۆ خەڵکانی دیکە، تا ئەوانیش سودی لێ ببینن.
- چیرۆك باشترین ڕێگەیە بۆ پەروەردەو فێربوون، هەوڵبدە ئەم ڕێگایە هەرگیز فەرامۆش نەکەیت.

محەممەد لــە قوتابخانە گەڕایـــەوە، جلوبەرگی قوتابخانەی گۆڕیو جلەکانی ماڵەوەی پۆشـــیو دەســـتو دەمو چاوی شۆردو ڕۆیشـــت بۆ چێشـــتخانە بۆ خواردنی نانی نیـــوەڕۆ، لەبەردەمی چێشـــتخانەدا ڕەییانی خوشـــکی بینـــی، کە لەبەردەمـــی دایکیدا وەستابوو، دایکی ملوانکە ئاڵتوونییەکەی بۆ دەکردە ملی.

محەممەد ڕۆیشـــتە سەرخوانەکەو ســـلاوی لە باوکی کردو دەســـتی بەنانخواردن کرد، بە دەم نانخواردنەوە پرسی: بابەگیان ئەمڕۆ مامۆســـتاکەمان دەیگوت: ئێمە خاوەنی سەروەتێکی زۆری ئاڵتونی سپین..

ئایا ئاڵتون زەردو سپی هەیە؟!

باوکی گوتی: بەڵێ کوڕی شـــیرینم، هەر زەردو سپی نا، بەڵکو ئاڵتونی ڕەشیشمان هەیە!

محەممەد وتی: چۆن بابەگیان؟ خۆ دایکمو ڕەییان تەنها ئاڵتونی زەردییان هەیە!

باوکی وتی: نەخێر کاکە محەممەد، ئێمە هەر سێ جۆرەکەیمان هەیە، سپی، ڕەش، زەرد، دوای نانخواردن بۆت باس دەکەم.

پاش نانخواردن.. چوونە ژووری دانیشتنو باوکی گوتی: کوڕی خۆم:

* ئاڵتونی سپی.. ئەوەیە کە دەیپۆشینو لەبەری دەکەین، بەو لۆکەیە دەوترێت، کە جوتیارەکانمان بەرهەمی دەهێنن، پاشان بەرهەمەکەی کۆدەکەنەوەو دواتر دەیفرۆشنو لە کارگەکاندا دەکرێت بەو جلوبەرگە لۆکەیەی کە ئێستا لەبەرماندایە، هەرچەندە ئێمە کارگەی دروستکردنی جلوبەرگمان نییە، بەو هیوایەی لە ئایندەدا ئەو کارگەیەش لە شارەکەمان بکرێتەوە، ئەوەش سەرمایە ئاڵتونییە سپییەکەمان، کە لەو سەرمایەیە جوانترین جلوبەرگ، دروست دەکەین، کە بەشی زۆری لۆکەی وڵاتەکەمان هەناردەی دەرەوە دەکرێت، بەو هۆیەوە پارەیەکی باشمان دەست دەکەوێت، بەڵام لە شێوەدا ئاڵتون نییە، بەڵکو لە نرخو بەهادا وەکو ئاڵتون وایە.

* ئاڵتونی ڕەش.. ئەو نەوتەیە کە لە وڵاتەکەماندا هەیە، وڵاتەکەی ئێمە خاوەنی چەندین کێڵگەی نەوتییە، لەو نەوتە خامە هەموو شتێکی وەکو: بۆری، پلاستیك، قوماش، نایلۆن، ئاوریشمی پیشەسازی، چەرمی پیشەسازی، جۆرەها دەرمانو چەندین شتی دیکەی لێ دروست دەکرێت، ئەمە جگە لە نەوتو بەنزینو گازو جۆرەکانیان، کە هەموویان سەرچاوەکەیان ئەو نەوتە خامەیە کە لە وڵاتەکەماندا هەیە..

کوڕی شـــیرینم: ئێســـتا دەزانیت بۆچی بە هـــەر یەك لەوانە دەوترێت ئاڵتون؟

محەممەد گوتی: بەڵێ بابە گیان، چونکە سەرچاوەیەکی گەورەن بۆ داهاتی وڵاتەکەمان، هەروەها ماددەیەکی خامن، زۆر شتیان لێ دروســـت دەکرێت، لە لۆکە جۆرەها قوماشو جلوبەرگ دروست دەکرێت، نەوتی خامیش لە جۆرەها پیشەسازیدا بەکاردەهێنرێت..

دایکی محەممەد کە گوێی بۆ وتوێژی نێوان هاوسەرو کوڕەکەی گرتبـــوو، گوتی: ئافەریـــن محەممەد، تۆ منداڵێکـــی زیرەکی، بە خێرایی لە شتەکان تێدەگەیت..

پوختە:

✍ مەرج نییە تەنها پشت بە یەك شت ببەستین بۆ زیادکردنی داهاتمان.

✍ هەمیشە پرسیار بکە لە هەر شتێك کە نایزانیت، تەنانەت ئەگەر نەتتوانی لە مامۆســـتاکەت بپرســـی هەوڵ بدە، لە دایكو باوکت بپرسی، با ئەوان بۆت ڕوون کەنەوە.

✍ پرســـیارکردن، هیچ عەیب نییە، بەڵکـــو نەزانین عەیبە، کەواتە بۆئەوەی نەزان نەبیت، بپرســـە.. کوردیش دەڵێت: دەڵێن بە پرسیار دەچییە بەغدایە، دەبییە شارەزای هەموو ڕێگایە!

پادشـــایەك هەبوو، هەروەکو هەموو پادشاکانی دیکەی دونیا، خاوەنی زۆرێك موڵكو ســـەروەتو سامانی بێ شومار بوو، بەڵام ئەوەی زۆر دڵی پێی خۆشبوو، عەمامەیەکی نەخشێنراو بوو لە تاڵی ئاڵتونی دەگمەنو گرانبەها، جەنابی پادشا تەنها لە ئاهەنگو بۆنەکاندا ئەو عەمامەیەی لەسەر دەکرد، لە تەواوی وڵاتدا جگە لە پادشا هیچ کەس خاوەنی ئەو عەمامەیە نەبوو..

ڕۆژێکیان یەکێـــك لە وەزیرەکانی زۆر حـــەزی لە عەمامەکەی پادشـــاکرد. چونکـــە زۆر لای جوان بوو، ئاواتەخـــواز بوو، بە هەر شێوەیەك بێت، ببێتە خاوەنی عەمامەیەکی لەو شێوەیە، بەڵام چۆن؟ چونکە پارەیەکی زۆری دەوێت، ئەویش خاوەنی ئەو پارە زۆرە نییە، لەبەرئـــەوە بیری لە پیلانێك کردەوە، ئـــەوەی بەبیریدا هات تەنها ڕێگە چارە بریتی بوو، لە دزینی عەمامەکەی پادشـــا، لە دڵی خۆیدا وتی: هەرگیز پادشا گومان لە من ناکات، چونکە من چەندین ساڵە وەزیری پادشـــام، هەرگیز هیچ شـــتێکم نەدزیوە تا ئێستا گومانم لێ بکات، هەروەها بە وەزیرێکی ئەمینو دەستپاك ناسراوم، هاوکات من بەردەوام ڕۆژانە لە نێو کۆشـــکدام، پاسەوانو خزمەتگوزاری زۆر لە نێو کۆشکدا هەیە.. دڵنیام پاشا نازانێت کێ عەمامەکەی بردووە!

وەزیـــر بۆ ئەم مەبەســـتە پلانێکی تۆکمـــەی دانا، ڕۆژێك کە پادشـــا میوانی زۆری هەبوو، بە میوانەکانییەوە ســـەرقاڵ بوو، دەرفەتی هێناو خۆی گەیاندە شوێنی عەمامەکەو هەڵیگرتو لە

نێو جلەکانیدا شاردییەوەو بەپەلە بەرەو ماڵ گەڕایەوە، لە نێو حەوشـــەی ماڵەکەیدا چاڵێکی بۆ هەڵکەند، عەمامەکەی خستە نێو سندوقێکەوەو لەناو چاڵەکەدا شاردییەوە.

چەند ڕۆژێك تێپەڕی، پادشـــا بـــە نیازی ســـازدانی ئاهەنگێکی گەورەبوو لە نێو کۆشکدا، داوای کرد تا عەمەماکەی بۆ بهێنن و بیکاتە سەری، بەڵام زۆر گەڕان عەمامەکەیان نەدۆزییەوە، کوڕەکەی هاتە لای باوکی و پێی گوت: بابە وا هەســـتەکەم عەمامەکەیان بردبێت، چونکە لە شـــوێنی خۆی نەماوە، پادشاش بە کوڕەکەی دەڵێت: ئەم هەواڵە لای هیچ کەس باس نەکەیت، بڕۆ هاوشـــێوەی عەمامەکەی خۆم عەمامەیەکم بۆ دروســـت بکە، تا کەس هەست بەوە نەکات لە کۆشـــکی پادشـــا دزی کراوەو پاشـــانیش لەم ڕێگەیەوە دەتوانین دزەکە بدۆزینەوە، کوڕەکەی وتی چۆن؟ پادشا وتی: دواتر دەزانیت ئێستا بڕۆ عەمامەکەم بۆ دروست بکە. کوڕەکەی ڕۆیشت هەمان عەمامـــەی بۆ دروســـتکردو هێنایەوە بۆ باوکـــی، ئەویش لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا عەمامەکەی لەسەر کرد، ئامۆژگاری کوڕەکەی کردو پێی وت: لەبەردەم دەرگای کۆشـــکدا بووەســـتە، ئەگەر هەر کەس چووە دەرەوەی کۆشك بزانە کێیەو بۆ کوێ دەڕوات؟

پادشا بە عەمامە نوێیەکەوە بەرەو حەوشەی کۆشك بەڕێکەوت، کاتێك جەنابی وەزیر چاوی بە عەمامەکەی پادشا کەوت، سەرسام بوو، لە دڵی خۆیدا وتی: دەبێت پادشـــا چۆن شوێنی عەمامەکەی

زانیبێت؟ لە ناکاو وەزیر خۆی دزییەوەو ئاهەنگەکەی بەجێهێشت، لە کۆشـــک چووە دەرەوە، شازادەو پاســـەوانەکانی بە نهێنی دوای کەوتن، وەزیر گەیشـــتە ماڵەوە، بەپەلـــە چاڵەکەی هەڵدایەوە، سەری سوڕما، بینی سندوقەکە لە شوێنی خۆیەتی، ویستی خێرا چاڵەکە داپۆشـــێتەوە، بەڵام شازادە توند دەستی گرتو وتی: ناپاک دزیت لە باوکم کردووە؟! پاشان سندوقەکەیان دەرهێناو وەزیریان بـــە کەلەپچە کراوی بردەوە بۆ لای پادشـــا، پادشـــا فەرمانی کرد، زیندانی بکەنو لە پۆستەکەی دووری بخەنەوە. جەنابی وەزیر، عەمامەکەشو پۆستەکەی لە دەست دا!

پوختە:

✍ هەرگیز بیر لە تاوان مەکەرەوە، ئەگەر بۆ یەکجاریش بێت، جەنابی وەزیر یەك تاوانی کرد، ویستی ببێتە خاوەنی عەمامەیەك، بـــەڵام نەبووە خاوەنـــی عەمامەکە، هـــاوکات چـــووە زیندانیش، پۆستەکەشی لەدەستدا، سومعەو ناوبانگیشی لەدەست دا.

✍ دڵنیابە ئەگەر لە جـــاری یەکەمدا لە ئەنجامدانی تاوانێکدا سەرکەوتوو بیت، ئەوا جاری دووەمو سێیەمیش ..هتد، ئەو تاوانە ئەنجام دەدەیتەوە، تا وەکو وەزیر دەبیتە قوربانی دەستی تاوانەکەت.

✍ هەرگیـــز زیاد لە توانای خۆت پێ ڕامەکێشـــە، بەخیلیو ئیرەیی بە کەســـانی لە خۆت سەروتر مەبە، سەیری کەسانێك بکە، کە لە خوار تۆوەن!



# ڕزگاربوون لە ڕاستگۆییدایە

ڕانیاو سـۆمای هاوڕێی، بە مەبەسـتی کڕینی پێداویستییەکانی قوتابخانە، پێکەوە دەڕۆن بۆ پەڕاوگە، کاتێك گەیشتنە پەڕاوگەکە، دەفتەرو پێنووسو لاسـتیكو ...و سـەرجەم پێداویستییەکانیان کڕی، پاشـان گەڕانەوە بەرەو ماڵ، سۆما هەستی کرد جزدانەکەی ونکـردووە.. زۆر گەڕان بەڵام نەیانتوانی بیدۆزنەوە. سـۆما زۆر ترسـا، وتی ئێستا من چی بکەم، چی بڵێم بە دایکم؟ بەردەوام بیری دەکردەوە، ڕانیا هەوڵی دا دڵخۆشی بداتەوە، بەڵام سۆما وتی: باشترە بە دایکم بڵێم، دز جزدانەکەی فڕاندومو ڕایکردووە، منیش نەمتوانیوە دوای بکەوم، نەبادا زیان بەخۆشـم بگەیەنێت، بەمشـێوەیە دایکم سـزام ناداتو دەڵێت بەس نییە خۆت سەلامەتی، پارەو جزدان هیچ نییە! ڕانیا کەمێك بێدەنگ بوو، پاشـان وتی: نەخێر سـۆما ئەمە درۆیە، پێویستە تۆ ڕاستی بڵێی ئەگەرچی سزاش بدرێیت، چونکە ئەگەر ئەمڕۆ درۆ بکەی، سبەی دەبیتە کەسێکی درۆزن!

سـۆماش سوپاسـی ڕانیای کـرد بـۆ ڕێنمایـیو ئامۆژگارییو دڵسۆزییەکەی، پاشـان بڕیاری دا کە ڕاسـتییەکە بە دایکی بڵێ، کاتێك گەیشتەوە ماڵ، ڕووداوەکەی وەکو خۆی بۆ دایکی گێڕایەوە، سـەرەتا دایکی کەمێك توڕەبوو، بەڵام دواجار سوپاسی کچەکەی کرد، چونکە ڕاستگۆ بووەو درۆی لەگەڵدا نەکردووە. دوای چەند ڕۆژێك زەنگی تەلەفۆن لێیدا، کەسـێکی ئەمینو دەسـتپاك بوو، جزدانەکەی سۆمای دۆزیبووەوە، بینیبووی لەناوجزدانەکە ناونیشانو

ژمارە تەلەفۆنی تیایە، پەیوەندی کردبوو تا بۆیان بگێڕێتەوە!

دوای ئـــەوە ڕانیا ڕۆژێك ویســـتی هەواڵی ســـۆما بپرســـێت، بۆ ئەو مەبەســـتە بڕیاری دا ســـەردانی بکات، کاتێك ڕۆیشـــت بۆ ماڵی ســـۆماو هەواڵی پرسی ئەویش زۆر بەدڵخۆشـــییەوە پێی ڕاگەیاند، کە جزدانەکـــەی کەوتبووە لای کەســـێکی ئەمین‌و دەســـتپاك بۆی هێناوەتەوە بۆ ماڵەوە! ڕانیاش بەم هەواڵە زۆر دڵخۆشـــبوو، پاشـــان پێی گوت: ئەگەر لەگەڵ دایکت درۆت بکردایەو ئەو کات بتگوتایە دز جزدانەکەی بـــردووم، دواتر ئەو پیاوە ئەمینە تەلەفۆنی دەکردو دەیگوت جزدانەکەت لای منـــە.. ئەو کات چیت بە دایکت دەگوت؟!

سۆما وتی: من سوپاسی خودا دەکەم، پاشان سوپاسی تۆ دەکەم هاوڕێی ئازیزم، کە گوێم بۆ ئامۆژگارییەکەی تۆ گرت، ڕاستییەکەم بە دایکم وت، ڕانیا تۆ ڕاست دەکەیت، هەمیشە ڕزگاربوون لە ڕاستگۆییدایە.

پوختە:

- دڵنیابن هەمیشە ســـەرفرازی‌و ڕزگاربوون لە ڕاستگۆییدایە، هیچ کات قسەی ناڕاست‌و درۆ مەکەن، کورد وتەنی پەتی درۆ کورتە.
- هاوڕێـــی بـــاش هەمیشـــە مـــرۆڤ لە خراپـــەو تاوان دووردەخاتەوەو ڕێنمایی دەکات بەرەو چاکەو کاری باش، کەواتە وریابە بزانە کێ دەکەیت بە هاوڕێی خۆت.
- درۆ هـــەر درۆیە، ئەگەر یەك وشـــەش بێت، بێگومان مرۆڤ لە درۆیەکەوە فێری درۆزنی دەبێت.

دایکـــی لە بازاڕ گەڕایەوە، زەمبیلەیەکی گەورەی پڕ لە میوەی لە سێوو قەیسیو ترێی لەگەڵ خۆی هێنابوو، نور بەپەلە بەرەو لای زەمبیلەکەی ڕۆیشتو سێوێكو ٣ دەنك قەیسیو هێشویەك ترێی دەرهێناو دەستی کرد بە خواردنی.

دایکی کە بینی نور وا دەســتیکردووە بــە میوە خواردن، پێی گوت: کچەکەم میوەکان بشۆرەوە پێش ئەوەی بیانخۆیت، چونکە میوە پێش شۆرینەوە پاك نین، نور سەیرێکی میوەکانی کردو وتی: دایەگیان پاکن هیچیان پێوە نییە، تۆزێك خۆڵاوی بوون بە دەست پاکم کردنەوە.

دایکیشـــی میوەکانـــی لـــە زەمبیلەکە دەرهێناو خســتییە نێو تەشتێکی گەورەی پڕ لە ئاو، زۆر بە جوانی میوەکانی شۆردەوە، دوای ئەوەی بە تەواوی میوەکانی شۆردەوە، لە ئاوەکە دەریهێنانو هەریــەك لــە میوەکانی لە ســەبەتەیەکدا داناو خســتییە نێو سەلاجەکەوە.

دوای ئــەوەی دایکی لە کارەکەی تەواو بوو، ســەیرێکی نوری کردن بینی وا لە میوە خواردن بەردەوامە، توڕەبوو لە نور، وتی: پێم نەگوتی پێش خواردنیان میوەکان جوان بشۆرەوە، ئەو میوانە پاك نین، تووشی ژانە سکت دەکەن!

لـەو کاتـەدا نور دەسـتی کردە گریـان، وتـی: دایەگیان تۆ ڕاست دەکەیت سـکم زۆر ئازاری هەیە، دایکی بەپەلە بردی بۆ نەخۆشخانە، پزیشـکەکە وتی: چییەتی، دایکیشی ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوەو وتی: میوەی نەشۆراوەی خواردووە!

پزیشـکەکەش دەرمانـی بۆ نووسـیو پێی گـوت: کچەکەم، پێویسـتە بە خێرایی ئەم دەرمانە بخۆین پێش ئەوەی دووچاری ژەهراویبـوون ببیت، هەروەها پێش ئـەوەی میوە بخۆی زۆر بە جوانی بیشۆرەوە..

نور دەرمانەکانی وەرگرتو سەیرێکی پزیشکەکەی کردو وتی: خۆ من هیچ شـتێکی خراپم نەخواردووە، تەنها میوەم خواردووە، دایکی وتی: ڕاست دەکات میوەی خواردووە پێش ئەوەی بشۆرێتەوە!

دکتۆرەکە سـەیرێکی نـوری کردو وتی: نـور ئایا دەزانیت زۆرێك لە مێرووی زیانبەخش لەسـەر میوەکان دەژین، جوتیار هەڵدەستێ بە رشـاندنی دەرمان بەسەر میوەکانیدا، بۆ ئەوەی ئەو مێرووە زیانبەخشـانە بکوژێت، کـە دووچاری میوەکانی هاتوون، ئەو دەرمانانەش لەسـەر میوەکان دەمێننەوە، تا ئەو کاتەی زۆر بەجوانی بە ئاو دەشۆرێتەوە، هەروەها ئەو میوانە کە لە بازاڕدا نمایشـکراون، تۆزو خۆڵێکی زۆری لێ دەنیشێت،

پێویســـته هیچ میوەو ســـەوزەیەك نەخۆین تـــا زۆر بە جوانی دەیانشۆینەوە.

نـــور وتی: من زۆر داوای لێبوردن دەکەم، بەڵێن دەدەم کە ئەم کارە دووبارە نەکەمەوە، هەروەها هەموو هاورێکانیشـــم ئاگادار دەکەمەوە کە پێش شۆردنەوە میوە نەخۆن!

پوختە:

✍ میوە زۆر بەســـوودە بۆ مـــرۆڤ، پێویســـتە ڕۆژانە میوە بخۆین، بـــەڵام ئەگەر بە جوانی نەشـــۆریتەوە پێـــش خواردن، ئەو کات لەبری ســـوود زیانی لێدەکەین و دووچاری نەخۆشـــی و ژەهراویبوونمان دەکات.

✍ هەرگیز پەلەمەکە لەو شتەی حەزت لێیەتی، چاوەڕوان بکە، تا هەموو ئەندامانی خێزان کۆدەبنەوەو پێکەوە دادەنیشن و لە کەشـــێکی خۆش و ئارامدا، لەســـەر خوانێکی جوان پێشکەش دەکرێت، ئەو کات دەست بە خواردن بکە.

✍ ئەگەرچی دەرمان تاڵە، بەڵام کاتێك دووچاری نەخۆشـــی دەبین، دەبێت ئەو تاڵە بنۆشین، تا لە ئازارو ناڕەحەتی ڕزگارمان ببێت.

سیما هەر لە سەرەتای تەمەنیدا بە دایکی دەگوت: من دەمەوێت ببمە پزیشك، دایكیشی هەموو جارێك لە ئامێزی دەگرتو بەوپەڕی سۆزو خۆشەویستییەوە پێی دەگوت: ئەگەر دەتەوێت ببیتە پزیشك پێویستە كۆششی زۆر بكەیتو خۆت ماندووبكەیت، تا پلەی بەرز بەدەست بهێنیت، ئەو كات كە گەورە بوویت دەبیتە پزیشك.

سیما هەموو جارێك كە لەگەڵ دایكی دەچووە بازاڕ، ئەو یارییانەی دەكڕی كە لە شێوەی كەلوپەلە پزیشكییەكاندان، داوای لە دایكی دەكرد عەزییەكی سپی بۆ بكڕێت، لە شێوەی ئەو عەزییەی كە پزیشكەكان لەبەری دەكەن، لە نەخۆشخانەدا.

هەروەها بەردەوام حەزی بە سەیركردنی ئەو فیلمو درامایەنە دەكرد، كە دكتورێك تیایدا ڕۆڵی پاڵەوانی فیلمەكە دەبینێت، هەر كاتیش لەگەڵ هاوڕێكانی یاری بكردایە، حەزی دەكرد ڕۆڵی پزیشك ببینێت، كەلوپەلی یارییەكانی ئامادە دەكرد، عەزییە سپییەكەی لەبەردەكرد، بە هاوڕێكەی دەگوت: تۆ ڕۆڵی نەخۆش ببینە، هاوڕێكەی بە ناڵە ناڵو هاوار هاوار خۆی دەكرد بە ژووورداو دەیگوت ئاه سكم، ئاه سكم!

دكتۆرە سیماش چاویلەكەی دەكردە چاویو سەماعە پزیشكییەكەی دەكردە گوێیو دەستی دەكردە پشكنینی هاوشێوەی دكتۆر، پاشان پێی دەگوت: دەزانم سكت ئازاری هەیە، دەزانیت بۆچی؟

هاوڕێکەشی دەیگوت: نا دکتۆرە نازانم بۆچی؟؟

دکتۆرە سیماش دەیگوت: ئەوە سەوزەو میوەت خواردووەو نەتشۆردۆتەوە.. ئەوە بووەتە هۆی ئەوەی سکت بیداتە ئازار..

سیما هەمیشە سەبارەت بە زانستی پزیشکی کتێبی دەخوێندەوەو حەزی بە خوێندنەوەی ژیانی پزیشکە سەرکەوتووەکان دەکرد، ڕۆژەکان تێپەڕین، سیما ساڵ بە ساڵ سەرکەوتنی زیاتری تۆمار دەکرد، تا ئەوەی سیما گەیشتە قۆناغی شەشەمی ئامادەیی، ڕۆژێکیان باوکی چپەیەکی کرد بە گوێی کچە شیرینەکەیداو وتی: سیما گیان، تۆ لە بەدیهێنانی ئامانجەکەت زۆر نزیك بوویتەوە، پێویستە زۆر زیاتر لە ساڵان خۆت ماندوو بکەیت، بۆئەوەی بەرزترین نمرە بەدەست بهێنیت، تا بتوانیت بە ئاسانی بچیتە کۆلێژی پزیشکی.

سیما وتی: بە چاوان بابەگیان، من زۆر بە باشی تێدەکۆشم، بۆئەوەی بتوانم خەونەکەم بهێنمە دی.

ئەو ساڵە لە پۆلی شەشەمی ئامادەیی زۆر خۆی ماندوو کرد، شەوو ڕۆژی خستبووە سەریەك بۆ هێنانەدی ئاواتەکەی، دواجار ساڵ تەواو بوو، تاقیکردنەوەکان ئەنجام دران، ڕۆژی وەرگرتنی نمرە هاتەپێش، سیما کاتێك نمرەکانی وەرگرتەوە زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە نمرەیەکی زۆر باشی بەدەست هێنابوو، دواجار خەونەکەی هاتەدیو لە کۆلێژی پزیشکی وەرگیرا، حەزی کرد

ببێته پزیشکی منداڵ، لەبەرئەوە، ئەو بەشەی هەڵبژارد!

ئێستا دکتورە سیما دکتورەیەکی زۆر هێمن و لەسەرخۆو بە توانایە، زۆر بە جوانی مامەڵە لەگەڵ منداڵەکاندا دەکاتو ئەوانی زۆر خۆشدەوێت، زۆر بە پەرۆشەوە تێدەکۆشێت لەگەڵیاندا، تا ئەو کاتەی بە تەواوی چاك دەبنەوە.

هەر کات منداڵێك پێی دەڵێت: منیش دەمەوێت وەکو تۆ ببمە دکتۆرێکی شارەزا، دکتورە سیما زەردەخەنەیەك دەیگرێو پاشان چیرۆکی ژیانی خۆی بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: منیش ئەو کاتەی منداڵ بووم، هیواو ئاواتم ئەوە بوو، ببمە پزیشك.

پوختە:

✍ پێویستە هەموو منداڵێك، هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە، ئامانجی خۆی دیاری بکاتو بزانێت دەیەوێت ببێت بەچی، باشترە ئەم ئامانجە لە دەفتەری یادەوەرییەکانیدا بنووسێت.

✍ دیاریکردنی ئامانجو نووسینی بە تەنها سوود بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت، پێویستە لەگەڵیدا هەوڵ بداتو خۆی ماندوو بکاتو تێکۆشان بە ئەندازەی خەونەکەی بکات. جوانیان وتووە: پلە بڵندی شەونخونی دەوێت.

✍ لەم چیرۆکەوە فێردەبین، کە هیچ شتێك ئاستەم نییە، ئەگەر مرۆڤ هەوڵ بداتو خۆی ماندوو بکاتو بەرەو ئامانجەکەی هەنگاوی ژیرانە بنێت.

شـــەیما لە پۆلی سێیەمی بنەڕەتی بوو، شەیما هەر کات دەهاتە سەرخوان بۆ نانخواردن، تەنها سرکەو زەلاتەی دەخوارد، هەموو جارێـــك دایکی پێی دەگوت: شـــەیما گیان، پێویســـتە لە هەموو جۆرەکانی خواردن بخۆیت، بۆئەوەی نەخۆش نەبیت..

بەڵام شەیما قەناعەتی بە قســـەکانی دایکی نەبوو، هەمیشە دەیگوت: دایەگیان، من تـــا تێر دەبم دەخۆم، ئیدی بۆچی نەخۆش دەبـــم، هەموو ڕۆژێك دایکی ئەم قســـەیەی بە شـــەیما دەگوت، شەیماش هەمان وەڵامی دەدایەوە.

ڕۆژێکیان شـــەیما لەگەڵ هاوڕێکانی لـــە گۆڕەپانی قوتابخانە یارییـــان دەکرد، هەســـتی بە ئازارێـــك کرد لە ئێســـکەکانیدا، هەستی دەکرد ناتوانێت ڕابکاتو یاری بکات لەگەڵ هاوڕێکانیدا، هاوڕێیەکـــی لێی نزیك بووەو پێی گوت: چی ڕووی داوە شـــەیما گیان، بۆچی ڕووخسارت تێکچووە؟!

شـــەیما وتی: ناتوانم بـــڕۆم، ئێســـقانەکانم زۆر ئازاری هەیە، هاوڕێکەی گوتی: هەســـتە با بڕۆین بۆ لای پزیشـــکی قوتابخانە، پێکەوە هەر چۆنێك بێت ڕۆیشـــتن بۆ لای پزیشـــکی قوتابخانە، شەیما ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی: لەناکاو هەستم بە ئازارێك کردو نەمتوانی ڕابکەم، ناچار دانیشتووم..

پزیشـــکەکە دوای پشـــکنین وتی: تۆ پێویســـتت بە هەندێك

شیکاریو پشکنینو تیشك هەیە..

شەیما سەری سوڕما، وتی: بۆچی جەنابی دکتور؟

دکتورەکە وتی: سبەی بڕۆ بۆ نەخۆشخانەو ئەم پشکنینو شیکارو تیشکە ئەنجام بدەو پاشان بۆم بهێنەوە، ئەو کات دەزانین کێشەت چییە!

بۆ ڕۆژی دواتر، شەیما ڕۆیشت بۆ نەخۆشخانە، سەرجەم ئەو پشکنینانەی پێویست بوو، بۆیان ئەنجام دا، دوای ئەوەی پشکنینەکانی تەواو کرد، چووە باوەشی دایکییەوەو وتی: ئێستا ئازارم زۆرترە، زۆر دەترسم ئەو هەموو پشکنینە بۆچی؟ دایکیشی دڵخۆشی ئەدایەوەو دەیگوت: مەترسە کچی خۆم، بە پشتیوانی خودا هەموو شتێك باش دەبێت..

بۆ ڕۆژی دواتر شەیماو دایکی ڕۆیشتن بۆ لای پزیشکی قوتابخانەکەو ئەنجامی سەرجەم پشکنینەکانیان بۆ بردەوە، بۆئەوەی بزانن شەیما چییەتی، پزیشکەکە سەیری ئەنجامی پشکنینەکانی کردو پاشان سەیری شەیمای کردو وتی: شەیما تۆ تووشی بەدخۆراکی بوویت.. بڕێك خوێی زۆر لە جەستەتدا هەیە.

شەیما لە مەبەستو قسەکانی پزیشکەکە تێنەگەیشت، لەبەرئەوە پرسی ئەوە مانای چییە؟

پزیشکەکە وتی: پێویستە گۆڕانکاری لە خواردنەکانتدا بکەیت،

هەموو جۆرە خواردنێك بخۆیت، چونكە جەستەی مرۆڤ پێویستی بـــە هەموو جۆرەكانـــی ڤیتامین هەیە، بۆئەوەی جەســـتەیەكی پتەوو بەهێزی هەبێت.. سەوزە، میوە، گۆشت، ماسی، نان، شیرو بەرهەمەكانی شیر، بخۆ، بەڵام سركە زۆر مەخۆ، چونكە سركە بووەتە هۆی ئەوەی خوێی زۆر لە جەستەتدا كۆببێتەوە، ئەوەش بووەتە هۆی دروستكردنی ئازار لە ئێسكەكانتدا!

دایكـــی وتی: جەنابی دكتـــور بەردەوام هەمـــوو ڕۆژێك ئەم قسەیەم پێ وتووە، بەڵام گوێی بە ئامۆژگارییەكانی من نەداوە!

ئەو كات شەیما زانی، كە جەستەی مرۆڤ پێویستی بە هەموو جۆرە خواردنێكە.

پوختە:

✍ هیچ كات ئامۆژگارییەكانی دایكو باوكت فەرامۆش مەكە، ئەوان لە هەموو كەس زیاتر دڵســـۆزی تۆنو بەرژەوەندی تۆیان لە خۆیان زیاتر دەوێت.

✍ بۆئەوەی جەستەیەكی بەهێزو پتەووت هەبێت، پێویستە هەموو جۆرە خواردنێك بخۆیت.

✍ جەســـتەی مرۆڤ پێویســـتی بە جۆرەهـــا ڤیتامین هەیە، هەرگیـــز هەموو ڤیتامینەكان لە یەك خواردندا نین، لەبەرئەوە گۆڕانكاری لە خواردنەكانتدا بكە.

شادیو شارۆو سارا هاوڕێ بوون، ڕۆژێکیان پێکەوە بڕیاریاندا بچن بۆ یەکێ لە باخچەکانی شـــار، هەر یەك لەوان ئەو شەوە مۆڵەتـــی چوونیان بۆ باخچـــە لە دایكو باوکیان خواســـت، بۆ بەیانـــی دوای تەواوبوونی دەوامی قوتابخانەیان، هەر ســـێکیان پێکەوە زۆر بە دڵخۆشـــیو خۆشحاڵییەوە، ڕوویان کردە یەکێك لە باخچە گەورەو فراوانو دڵگیرەکانی شار..

هەر کە گەیشـــتنە باخچەکە، دەســـتیان کرد بە گەڕان بە نێو گـــوڵو گوڵزارو درەختە جوانەکانی باخچەکەدا، باخچەکە دیمەنێکی زۆر جوانی دەبەخشـــییە ســـەردانکەرانی، گوڵەکانی باخچەکە لە لایەن کرێکارانی باخچەوە زۆر بە جوانی خزمەت دەکران، ســـیمایەکی زۆر جوانیان بەخیشـــبووە باخچەکە، سێ هاوڕێ لە نێو ئەو کەشـــە ئارامو دڵڕفێنەدا پێکەوە پیاســـەیان دەکردو باسیان لە جوانیو دڵگیری باخچەکە دەکرد..

لەو کاتەدا شادی گوڵێکی سوری زۆر جوانی بینی، بە تەواوی سەرنجی ڕاکێشـــا، بەخێرایی ڕۆیشـــت بۆ لای گوڵەکەو بانگی ســـاراو شـــارۆی کردو وتی: ئایا ئێوە تا ئێستا گوڵی وەها جوانو ناوازەتان بینیوە، تەماشای ڕەنگە جوانەکەی بکەن، بۆنی بکەن، بزانن بۆنەکەی چەندە خۆشو سەرنجڕاکێشە!!

شادی زۆر سەرسام بوو بەو گوڵە جوانو ناوازەیە، بە جۆرێك

وایدەزانی کە تائێستا گوڵی لەو شێوەی نەدیتووە، لەبەرئەوە دەستی درێژ کرد تا گوڵەکە لێبکاتەوە.. شارۆ دەستی گرتو وتی: شادی بۆچی دەتەوێت ئەو گوڵە جوانە لێ بکەیتەوە؟

شادی وتی: دەمەوێت لێی بکەمەوەو بیبەمەوە بۆماڵەوەو لە ژوورەکەی خۆم دایبنێمو پارێزگاری لێ بکەم!

سارا وتی: شادی ئایا دەزانیت، گوڵەکان کاتێك لە لقەکانیان دەکرێنەوە، دوای چەند کاتژمێرێك پەڕەکانیان هەڵدەوەرنو ڕەنگیان دەگۆڕێنو دواتر وشك دەبن؟

شادی: بۆچی وشك دەبن، لە کاتێکدا من کە گەڕامەوە ماڵ، پارێزگاری لێ دەکەمو چاودێری دەکەمو ئاوی دەدەم؟

شارۆ وتی: شادی گیان، ئەم باخچانە بۆ ئەوە نەڕازێنراونەتەوە بۆ ئەوەی هەر یەك لە ئێمە بێت گوڵێك کە بەلایەوە جوانو سەرنجڕاکێشە، لێی بکاتەوە، بەڵکو ئەم باخچانە بۆ ئەوە دروستکراونو ڕازێنراونەتەوە، تا شەقامو شارەکانمان جوانو ڕازاوە بکەنو بۆنو بەرامەی خۆشیان پێ ببەخشن.

ئەو کات شادی سەیرێکی هاوڕێکانی کردو وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی هاوڕێی وەکو ئێوەی پێ بەخشیوم، کە ئەگەر ویستم هەڵەیەك بکەم، ڕێگەم لێدەگرنو ئامۆژگاریم دەکەنو ڕێگە نادەن کاری هەڵە ئەنجام بدەم.

پاشـــان شـــادی لەگوڵەکە دوورکەوتەوەو وتی: بەڕاستی لە ژیانمدا گوڵـــی وەها جوانم نەدیتووە.. هەمووان دەســـتیان کرد بە پێکەنین‌و ڕۆیشـــتن تا بەنێو گوڵو گوڵزارەکانی باخچەکەدا کاتێکی خۆش بەسەربەرن.

پوختە:

✍ هەر کات ویستمان لەگەڵ هاوڕێکانمان بڕۆین بۆ شوێنێك، پێویستە سەرەتا مۆڵەت لە دایك‌و باوکمان وەربگرین.

✍ گوڵـــی باخچـــەکان بـــۆ ڕازاندنـــەوەی باخچەکانـــە، بۆ بەرژەوەندی هەمووانە، نەك بۆ بەرژەوەندی یەك کەس، ئەگەر بڕیار بووایە هـــەر کەس گوڵێکی جوان لە باخچە ببینێت‌و لێی بکاتەوە، شادی‌و هاوڕێکانی ئەو گوڵەیان نەدەبینی، چونکە پێش ئەوان کەسانی تر کە دەیانبینی لێیان دەکردەوە.

✍ وەزیری پەروەردەی چین، بەیانییەکیان بەرەو وەزارەتەکەی دەڕۆیشـــت، لە ڕێگەدا بینی قوتابییەك گوڵێك لێ دەکاتەوە، هەر گەیشتە وەزارەتەکەی نامەی دەستلەکارکێشانەوەی نوسی، وتیان: بۆچی قوربان، لە وەڵامدا وتی: دیارە لە سیســـتەمی پەروەردەدا کەم‌وکوڕی هەیە، ئەگینا قوتابییەك گوڵ لێ ناکاتەوە.

کەواتە ئەگەر گوڵێك نەڕوێنیت، هیچ نا گوڵەکان ئازار مەدەو لێیان مەکەرەوە.

ڕۆژێکیان کرداره بیرکارییەکان کۆبوونەوە، وتیان: پێویستە شارێك بە ناوی خۆمانەوە بنیات بنێین و هەروەکو شاری پیتەکان و شاری ژمارەکان، پێویستە ئێمەش شارێکمان هەبێت..

بۆ ئەم مەبەستە دەستیان کرد بە بنیاتنانی شاری کرداره بیرکارییەکان، دوای ئەوەی شارەکە بنیاتنرا، دانیشتوانی شار وتیان: پێویستە سەرۆکێك بۆ ئەم شارە هەڵبژێرین، کەواتە دەبێت هەڵبژاردن ئەنجام بدەین و یەکێك لە نێوان خۆماندا هەڵبژێرین.. چوار کردارەکە خۆیان پاڵاوت بۆ هەڵبژاردن.. دانیشتوانی شار وتیان: پێویستە هەر یەك لە چوا کرداره بیرکارییەکە سەرەتا لەبەردەمی جەماوەردا خۆیان بناسێنن و کارو پرۆژەکانیان ڕابگەیەنن، پێمان بڵێن: ئەگەر هەر یەك لەوان بوونە سەرۆك چیمان بۆ دەکەن؟

پاڵێوراوی یەکەم: بەمشێوەیە خۆی ناساند: من ناوم (کۆ) یە، ئەمەش نیشانەکەمە (+)، من هەمیشە ژمارەکان زیاد دەکەم، ئەو ژمارەی کە لە لامە کۆی دەکەمەوە لەگەڵ ئەو ژمارەیەی کە دواتر دێتە لام، هەمیشە ژمارەکان لەگەڵ مندا زیاد دەکەن، هەرگیز کەم ناکەن، ئەگەر من لە هەڵبژاردن دەربچم و ببمە سەرۆکی شار، هەموو هێزم کۆدەکەمەوەو کاردەکەم لە پێناوی شارەکەم، ئامادەبووان چەپڵەبارانیان کرد.

دواتر پاڵێـــوراوی دووەم هاتو وتی: من ناوی (کەم)ە، ئەمەش نیشـــانەکەمەە (-)، من هەمیشـــە جیـــاوازی دەکـــەم لە نێوان ژمارەی گەورەو بچوکدا، ئەگەر دەربچم لە هەڵبژاردن، زەکاتو خێرو بەخشـــینەکان، لە دەوڵەمەنـــدەکان وەردەگرم، کە ژمارە گەورەکانن، دەیبەخشـــم بە ژمارە بچووکەکان کە هەژارەکانن، ئامادەبووان چەپڵە بارانیان کرد.

پاشان پاڵێوراوی سێیەم هاتو وتی: من ناوم (دابەش)ە، ئەمەش نیشانەکەمە (÷)، من هەمیشە ژمارەکانی کە لەلامە، بە یەکسانی دابەشی دەکەم بەسەر ئەو ژمارانەی کە دواتر دێن بۆ لام، ئەگەر من لە هەڵبژاردن دەربچم، ئەوە زەوییە کشتوکاڵییەکانی شارەکەم بەســـەر لاوەکاندا دابەش دەکەم، بۆئەوەی کاری تێدا بکەنو شار ئاوەدان بکەنەوە، ئامادەبووان ئەویشیان چەپڵەباران کرد.

پاشان پاڵێوراوی چوارەم هاتو ئەویش بەمشێوەیە خۆی ناساند: مـــن ناوم (کـــەڕەت)ە، ئەمەش نیشـــانەکەمە (×)، من ژمارەکان کەڕەتی یەکتر دەکەم، بەوەش دەبنـــە دووهێندەو چەند هێندە، ئەگـــەر من لە هەڵبـــژاردن دەربچم، ئەوا ڕووبەری ســـەوزایی لە شـــارەکەم دوو هێندەو ســـێ هێندە زیاد دەکـــەم، ئامادەبووان چەپڵەبارانیان کرد.

دوای ئـــەوەی هەر چـــوار پاڵێوراوەکە کارو پـــڕۆژەی خۆیان پێشـــکەش کـــرد، ئامادەبووان ڕێککەوتن لەســـەر ئـــەوەی کە هـــەر چـــوار پاڵێوراوەکە (کۆ، کەم، دابەش، کـــەڕەت)، پێکەوە ســـەرۆکایەتی شـــارەکە بکەن، چونکە هیچیـــان ناتوانن بەبێ ئەوانی دیکە شـــارەکە بەڕێوە ببەن، هەمووان پێویســـتیان بە یەکتر هەیە.

پوختە:

- ئێمە هەمووان تەواوکەری یەکترین، کەســـمان ناتوانین ئەوی دیکەمان بسڕێتەوەو وابزانێت هیچ پێویستی بەوانی دیکە نییە. هاوشێوەی ئەندامەکانی جەستە، پێویستمان بە یەکترە.
- مرۆڤـــەکان پێکەوە جوانن، پێکەوە تەواوکەری یەکترن، هەر یەکەو لە لایەکەوە خزمەت دەکات.
- جیاوازییەکانـــی نێوانمان بۆ ئـــەوە نییە ڕقمان لە یەکتر بێتو دژایەتی یەکتر بکەین، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە هەر یەکەمان بەپێی پسپۆڕیو شارەزایی خۆی لایەنێکی گرنگی ژیان بگرێت.

شـــەماڵ کوڕێکی ژیـــرو زیرەكو بـــە توانابـــوو، ڕێكوپێكو پاكوخاوێن‌و ڕۆح ســـوك بوو، قوتابییەکان‌و مامۆســـتاکانی زۆر خۆشـــیان دەویســـت، هەمیشـــە بە پلەی بەرز لـــە قوتابخانە دەردەچوو، شەماڵ حەزی دەکرد هاوکاری هاوڕێکانی بکاتو ئەو وانانەی باش تێی نەگەیشتوون، ئەم زیاتر بۆیان ڕوون بکاتەوە.

بـــەڵام شـــەماڵ نەیدەتوانی لەگەڵ هاوڕێکانیـــدا یاری بکات.. چونکە شـــەماڵ لە منداڵییـــەوە دووچـــاری کەمئەندامی ببوو، نەیدەتوانـــی بـــە پێوە ڕابووەســـتێت، هەمیشـــە خۆی لەســـەر دارشەقەکانی ڕادەگرت.. هاوڕێکانی لەبەر خۆشەویستی شەماڵ بـــە دانیشـــتنانەوە یارییان لەگەڵدا دەکرد، هەمیشـــە لە دەوری شەماڵ کۆدەبوونەوە، بۆئەوەی هەست بە تەنهایی نەکات.

بـــەڵام یەکێك لە هاوڕێکانی کە ناوی حەســـەن بوو، جیاواز لە هاوڕێکانی دیکەی، هەمیشـــە خراپ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، گاڵتەی پێدەکردو پێی دەگوت: تۆ چ سوودێکت هەیە؟

شـــەماڵیش بەو قســـەیە زۆر نیگـــەران دەبوو، دەڕۆیشـــتە گۆشـــەیەکەوەو بە تەنهـــا دادەنیشـــت، تا هاوڕێکانـــی دیکەی دەڕۆیشـــتن بۆ لای‌و دڵخۆشـــییان دەدایەوە، بەتایبەت ئەحمەد، شـــەماڵی زۆر خۆش دەویست، هەموو جارێك پێی دەگوت: نابێت

تۆ بێتاقەتو نیگەران بیت، چونکـــە تۆ نموونەی بەختەوەریو خۆشحاڵیو هێزو توانایت!

پێویستە تۆ گوێ نەدەیت بە قسەی ئەو کەسانەی دەیانەوێت نیگەرانت بکـــەن، بێگومان هەر یەك لە ئێمە خاوەنی کۆمەڵێك سیفاتی جوانە، کە لەوانی دیکەمان جیا دەکاتەوە..

ڕۆژان هاتو ڕۆیشت، کاتی تاقیکردنەوەکان هاتە پێش، شەماڵ بـــە پلەی یەکـــەم توانی ســـەرکەوتن بەدەســـت بهێنێت، بەڵام حەسەن لە چەند وانەیەك کەوتبوو!

بەڵام لـــەو ڕۆژەدا، واتە ڕۆژی وەرگرتنـــەوەی ئەنجامەکان، شەماڵ گاڵتەی بە حەسەن نەکرد، بەڵکو بانگی کردو پێی گوت: من ئامادەم هاوکاریت بکەمو ئەو وانانەی تیایدا کەوتوویت زیاتر بۆت ڕوون بکەمەوە، تا بتوانیت لە خولی دووەم ســـەرکەوتوو بیت.. هەر هاوکارییەکت ویست من ئامادەم.. چونکە تۆ هاوپۆلو هاوڕێی منیت، ئەرکی سەرشانمە هاوکاریت بکەم!

حەســـەن وتی: شەماڵ تۆ چەند کەسێکی لێبوردەیت، لەگەڵ ئەوەشـــدا کە من هەمیشە بێزارو نیگەرانم کردوویت، بەڵام تۆ ئێستا هاوکاریم دەکەیت. حەسەن فێربوو، کە ئیدی نابێت گاڵتە بە هیچ کەس بکات، چونکە لەوانەیە ئەو زۆر لەو باشتر بێت.

پوختە:

✍ هەرگیــز نابێــت گاڵتە بە هیچ کەس بکەیــن، بەتایبەت کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت.

✍ هیچ کــەس کەمئەندامیی نەکڕیوەو کەســیش بە ئاواتی نەخواســتووە، کەواتە بــا لەبری ئەوەی گاڵتەیــان پێ بکەین، هاوکارییان بکەین و دڵخۆشییان بدەینەوە.

✍ لێبــوردن جوانترین ســیفاتی مرۆڤە، هــەوڵ بدە، وەکو شەماڵ هەمیشە وەڵامی خراپە بە چاکە بدەیتەوە.

ئـــارام لەگەڵ باوکیدا بە ڕێگەدا دەڕۆیشـــتن، بۆئەوەی بڕۆن بۆ ماڵی باپیرەیان، تا ســـەردانی باپیرەی بکەنو لە تەندروستیو کاروبـــاری دڵنیابن، ئـــەو ڕۆژە هەینی بوو، پشـــوو بوو، دەوامی فەرمانگەکان نەبوو، کرێـــکارەکان لەو ڕۆژەدا لە ماڵەوە بوون، خوێندکارەکان ئـــەو ڕۆژە ناڕۆن بۆ قوتابخانـــە، هەموو چینو توێژەکان جگە لە کەمینەیەك لە ڕۆژانی هەینیدا کارناکەن..

ئارامو باوکی لە وێستگەی پاسەکان ڕاوەستابوون، چاوەڕوانی هاتنی پاسیان دەکرد، دواجار پاسێك هاتو ئەمانیش سەرکەوتن، ئارام لای پەنجەرەکەوە دانیشـــتبوو، ســـەری لە پەنجەرەکەوە بـــردە دەرەوە، حەزی بە هەوای دەرەوە دەکرد، باوکی بەپەلە پێی گوت: کوڕی شـــیرینم، ئاگاداربە سەر مەبەرە دەرەوە، نەبادا ئەو ئۆتۆمبێلانەی کە بە تەنیشـــتماندا دەڕۆن، ئازارت پێ بگەیەنن، ئارام بەقسەی باوکی کردو سەری هێنایەوە نێو ئۆتۆمبێلەکە، پاش کەمێکی تر، ئارام هەستی بە هەوایەکی سازگار کرد لە دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکە، چونکە پاســـەکە بە نێو دارســـتانو بە ئاڕاستەی گوندەکەیان ڕێگەی دەبڕی، ئـــارام چیدی نەیتوانی خۆی بگرێت، ئەمجارەیان دەســـتی بردە دەرەوەو یاری لەگەڵ هەواکەدا دەکرد، دووبـــارە باوکی ئاگاداری کردەوەو وتی: تکایە دەســـتت بهێنەرە

ناوەوە، ئەگەر ئۆتۆمبێلێك بە تەنیشـــتماندا تێپەڕێت، زیانت پێ دەگەیەنێت..

پاش ماوەیەك گەیشتنە شوێنی مەبەست، لە پاسەکە دابەزین، بەڵام ماوەیەکیان مابوو بگەنـــە ماڵی باپیرەی، دەبوا ئەو ماوەیان بە پێ ببڕیایە، هەر کە دەســـتیان کرد بە ڕۆیشتن ئارام بەسەر شـــەقامەکەدا دەڕۆیشـــت، باوکی دەســـتی گرتو بردییە سەر شۆستەکەو وتی: کوڕم، دەبێت ئێمە پیادەکان بەسەر شۆستەکەدا بڕۆین، چونکە ئەوە ئێمە لە ئۆتۆمبێلەکان دەپارێزێت..

ئارام وتی: باشـــە ئەگەر ڕێگایەك شۆستەی بۆ نەکرابوو، ئەو کاتە چی بکەین؟

باوکی وتی: دەبێت لە لێواری شـــەقامەکەوە بڕۆین، دوور لە ئۆتۆمبێلەکان..

دوای ئەوەی شۆســـتەکە تەواو بوو، ئـــارام بەردەوام بوو لە ڕۆیشـــتن بۆ ئەوەی لە شـــەقامەکە بپەڕێتەوە، باوکی دەستی گـــرتو وتی: نا ئـــارام، دەبێت ئێمـــە لە شـــوێنی تایبەتییەوە بپەڕینەوە، واتە لەو شـــوێنەی کە بـــۆ پەڕینەوە دیاری کراوە، لەوێوە بپەڕینـــەوە، هەروەها دەبێت ســـەیری ترافیك لایتەکە بکەین، هەر کات لای ئێمە واتە پیادەکان ســـەوز بوو، نیشانەی

ئۆتۆمبێلەکان سوربوو، ئەو کات دەبێت ئێمە بپەڕینەوە..

پاشان پێش ئەوەی لە شەقامەکان بپەڕینەوە، دەبێت سەیری ئەم لاو ئەو لای شەقامەکە بکەین، پاشان سەیری لای ڕاستو چەپی خۆی کردو دواتر دەستی ئارامی گرتو پەڕینەوە لە شەقامەکە، پاشـــان ئارام وتی: بابەگیان بۆچی زیاتر لە جارێك ســـەیری لای ڕاستو چەپی شەقامەکەت کرد، باوکی وتی: بۆئەوەی دڵنیابین لە شـــەقامەکە، ڕێگەکە ئەمینو ئەمان بێت، چونکە ژیان زۆر بە نرخە، پێویستە پارێزگاری لە خۆمان بکەین.

پوختە:

✍ کاتێك سواری ئۆتۆمبێل دەبین، نابێت سەرمان، یان دەستمان بەینە دەرەوەی پەنجەرەکە.

✍ پێویستە لە کاتێکدا بەسەر شەقامەکاندا دەڕۆین، بەسەر شۆستەکاندا بڕۆین، نەك بەسەر شەقامەکان.

✍ کاتێك دەپەڕینەوە لە شـــەقام، پێویســـتە بەلای ڕاســـتو چەپی خۆماندا بڕوانین، تا دڵنیابین لە نەبوونی ئۆتۆمبێل، پاشان بپەڕینەوە.

لە دێر زەماندا سـێ هاوڕێ هەبوون پێکەوە دەژیان، ئەم سێ هاوڕێیە یەکێکیان جوتیار بوو، ئەوی دی نانەواو بوو، سێهەمیان وەسـتای دیوار بوو، پێکەوە لـە خانوویەکی بچکۆلانەدا ژیانیان دەگوزەرانـد، ئـەوان زۆر بە هـەژاریو کەمدەرامەتی ژیانیان دەگوزەراند، لەگەڵ ئەوەشـدا کە هەر سـێکیان خاوەن پیشە بـوون، بەڵام لەبەرئەوەی ئیشوکار زۆر ڕووی لە کزی کردبوو، ڕۆژانە بە کرێیەکی کەم کاریان دەکرد.

ڕۆژان هاتنو چوون، ئیشوکار بە تەواوی کەم بوو، تەنانەت نانی شـێویان بە زەحمەت دەستدەکەوت، هەر سێکیان لە ماڵە بچکۆلانەکەیان دانیشتبوون، لە لایەك دەبوا بەرگەی برسێتیان بگرتایە، لە لایەکی دیکەش دەبوا بەدوای کاردا بگەڕانایە.

ئێوارەیەکیان دەمـەو خۆرئاوابوون، پیاوێکی بە سـاڵاچوو، ڕووخسار جوان، لە دەرگای دان، جوتیارەکە دەرگاکەی کردەوە، پیاوەکە وتی: من ڕێبوارم دەتوانم ئەمشـەو تا بەیانی لەلای ئێوە بمێنمەوە؟

هەر سێکیان بە خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێکرد، ئەو ئێوارە تەنها کولێرەیەکیان هەبوو، لەگەڵ ئاو پێشکەشی میوانەکەیان کرد، خۆیان بە برسێتی مانەوەو هیچ شتێك نەبوو بیخۆن.

کاتێك کابرای بەساڵاچوو لە بارودۆخو گوزەرانیان وردبووەوە،

زۆر سەری ســوڕما، لەبەرئەوە وتی: ئایا ئێوە گەنجو بە تواناو بەهێزنو بەڵام نانیش نییە بیخۆن؟

ئەوانیش چیرۆکی ژیانی خۆیانیان بۆ گێڕایەوە..

ڕێبوارەکە بە جوتیارەکەی گوت: ئایا پاچو خاکەنازو پێداویستی زەوی کێڵانت هەیە؟

جوتیارەکە وتی: بەڵێ.. هەمــوو ئەوانەم هەیە.. ڕێبوارەکە وتی: ســبەی لەگەڵ من وەرن، زەوییەکتــان بۆ بەکرێ دەگرم، بیکەن بە گەنم، هاوڕێکانیشــت یارمەتیت ئەدەن، پاشــان کە گەنمەکە پێگەیشت کرێی زەوییەکە بدەن.

پاشــان کە گەنمەکــە پێگەیشــت، جەنابی وەســتا تۆ، بە هــاوکاری دوو هاوڕێکەی دیکەت دوکانێکی بچکۆلانە دروســت بکەو بیکەنە نانەوا، پاشــان گەنمەکە بکەن بە ئاردو وەستای نانەواکەش دەســـت بکات بە نانکردن، ئێوەش لە هەویر شێلانو نان برژاندن یارمەتی بدەن. واتە پێکەوە کارەکان تەواو بکەن. بەڵام تکایە هەژارو کــەم دەرامەتەکانتان بیر نەچێت، چونکە بەخشین دەروازەی فراوانی ڕزقو ڕۆزییە.

هەر بۆ بەیانی پێکەوە ڕۆیشتنو زەوییەکەیان بە کرێ گرتو دەستیان کرد بە چاندنی گەنم، ئیدی هەر بەو شێوەی ڕێبوارەکە پلانی بۆ دانان، کارەکانیان ئەنجامدا!

دوای چەند ساڵێك پیرەمێردی بەساڵاچوو، لەو شارەوە تێپەڕی، پرسیاری ئەو سێ هاوڕێیەی کرد.. بە پرسیار ئەوانی دۆزییەوە، کاتێك ڕۆیشتە لایان بینی وا هەر یەك لەوان بووەتە خاوەنی سەروەتو سامانێکی زۆرو زۆرو حاڵو گوزەرانیان زۆرباشە، هاوکات کەسانێکی خێرخوازنو بەردەوام یارمەتی هەژارو کەم دەرامەتەکان دەدەن.

ئەوانە تەنها یەکیان گرتو پێکەوە کاریان کرد، بوونە خاوەنی کارو توانیان سەروەتێکی باش دەست بخەنو هاوکاری هەژارو کەمدەرامەتەکانیش بکەن.

پوختە:

✍ نابێت مرۆڤ دابنیشێو چاوەڕێ بکات، باردۆخی بگۆڕێت، بەڵکو دەبێت هەوڵ بداتو تێ بکۆشێت، ئەگەر دەرگایەك داخرا بڕوات بە دوای دەرگایەکی دیکەدا.

✍ مرۆڤەکان پێکەوە دەتوانن ژیان تەواو بکەن، پێکەوە دەتوانن کار پەیدا بکەن، جوتیار بەبێ، نانەوا، نانەوا بەبێ وەستا، قوتابی بێ مامۆستا، پزیشك بێ نەخۆش، ناتوانن هیچ بکەن، هەمووان تەواوکەری یەکترین.

✍ ئەگەر یەکبگرینو پێکەوە هەوڵ بدەین، دڵنیابن دەتوانین هەموو کارێکی باش ئەنجام بدەین.

بارام لە قوتابخانە گەڕایەوە بۆ ماڵ، بەڵام بە جیاواز لە ڕۆژانی پێشـــوو، چونکە ڕۆژانی پێشـــوو، هەر لە دوورەوە بانگی دایکی دەکردو دەیگوت: دایە گیان گەڕامەوە، سڵاوتان لێبێت، بە قسەی خۆشو ڕووخســـارێکی گەشـــەوە دەهاتەوە ماڵ، بەڵام ئەمڕۆ بە پێچەوانەوە بە ڕووخســـارێکی خەمـــاویو ناوچەوانێکی گرژو تووڕەوە، بێئەوەی یەك قســـە بکات ڕۆیشـــت بۆ ژوورەکەی خۆی، دایکـــی بارام زۆر لای ســـەیر بوو، کە بارامی بەو شـــێوەیە بینی، چونکە هەرگیز بارامی بەو شێوەیە نەدیتبوو، لەبەرئەوە ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی بارامو پێی گوت: کوڕی شـــیرینم، شتێك ڕوویداوە؟ خۆ تۆ مۆڵەتت خواست کە دوای دەوامی قوتابخانە بڕۆیت لەگەڵ هاوڕێکانت یاری تۆپی پێ بکەیت، وتت کە یاریتان هەیە؟

بارام وتی: ڕۆیشتم یاریمان کرد، بەڵام.. دایکی: بەڵام چی کوڕم..

بارام قسەکانی بۆ تەواو نەکرا، دەستی کردە گریان، دواتر وتی: لە یارییەکەدا دەمەقاڵە دروســـت بوو، هەر دوو هاوڕێ: شاهۆو هەرێم بوو بە شـــەڕیان، شـــاهۆ پاڵێکی نا بە هەرێمەوە، هەرێم ســـەری بەردیوارەکە کەوتو سەری شکا، خوێن بە جەستەیدا هاتەخوارەوە، پاشان هەرێممان بردەوە بۆماڵەوە، باوکی بەپەلە بردی بۆ نەخۆشخانە.

دایکی وتی: (لاحول ولاقوة الا بالله)، بەڵام ئێستا پێویست نییە تۆ بگریت، بەڵکو پێویستە بڕۆیت لە تەندروستی هەرێم بپرسیتو لە باردۆخی ئاگاداربیت، پاشان هەوڵ بدەن، ڕێکیان بخەنەوەو ئاشتیان بکەنەوە لەگەڵ شاهۆ..

بارام کەمێك ئارام بووەوەو بڕیاری دا بڕوات بۆ ماڵی هەرێمو هەواڵی بپرسێت..

پاشان دایکی وتی: بارام تۆ ڕات چییە سەبارەت بەوەی ڕوویدا لە نێوان هاوڕێکانتدا؟

بارام وتی: دایە گیان زۆر نیگەران بووم بەو ڕووداوە، چونکە نابێت ئێمە یەکتری ئازار بدەین، چونکە ئێمە هاوڕێی یەکین، ئەگەر لە شتێکیشدا بیروڕامان جیاواز بوو، پێویستە بە گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە چارەسەری ناکۆکیو جیاوازی نێوانمان بکەین، نەم بە شەڕو لێدان.

دایکی وتی: ئافەرین کوڕی خۆم، شەڕو ئاژاوەو لێدان، چارەسەری هیچ گرفتو کێشەیەك ناکات، بەڵام بە لەیەك تێگەیشتنو ڕاگۆڕینەوەو گفتوگۆکردنو برایەتیو خۆشەویستی، دەتوانین چارەسەری هەموو کێشەو گرفتێك بکەین.

پوختە:

✍ ئەگەر لەگەڵ هاوڕێیەکمان ناکۆکیمان هەبوو، پێویستە بە ڕاگۆڕینەوەو گفتوگۆ چارەسەری کێشەکانی نێوانمان بکەین، نەك بە شەڕو ئاژاوە.

✍ هەمیشە شـــەڕو لێدان کێشەکان گەورەتر دەکەن، نەك بچوکتر، لەبەرئەوە مرۆڤی ژیر هەرگیز پەنا بۆ شـــەڕو لێدان نابات لەگەڵ هاوڕێکەی.

✍ هیچ شتێك لە دایكو باوکمان نەشارینەوە، چونکە هەمیشە ئەوان بیرکردنەوەیان لە ئێمـــە فراونترەو دەتوانن ڕێگەچارەی گونجاومان بۆ بدۆزنەوە.

خالیدو سـەردار هاوڕێی منداڵی بوون، ڕۆژانەو زۆربەی کاتەکان پێکەوەبوون، جگە لـەوەی هاوپۆلی یەکتر بوونو لە قوتابخانەش لە یەك جودا نەدەبوونەوە، زۆرێك لە یادەوەرییەکانی ژیانیان پێکەوە بوو..

ڕۆژێکیان سـەردار نەچووبوو بۆ قوتابخانە، خالدیش هیچ هەواڵێکی لێی نەبوو، نەیدەزانی بۆچی نەهاتووە، ئەو ڕۆژە زۆر پەرۆشی سەردار بوو، سـەرەتا گومانی برد، کە ڕەنگە نەخۆش بێت، بۆیە نەهاتۆتەوە، هەر چۆنێك بێت، ئەو ڕۆژەش دەوام تـەواو بوو، دوای ئەوەی گەڕایەوە مـاڵو نانی نیوەڕۆی خوارد، ڕووداوەکـەی بۆ دایکی گێڕایەوەو داوای لێ کرد، مۆڵەتی بدات؛ تا بڕوات بۆ ماڵی سەردارو هۆکاری نەهاتنەکەی بزانێت.. دایکی مۆڵەتـی پێداو خالیدیـش بەرەو ماڵی سـەرداری هاوڕێی بەڕێ کەوت، بەڵام ماڵی سـەردار کەسیان لە ماڵ نەبوو، لەبەرئەوە نەیتوانی هەواڵی سـەرداری هاوڕێی دەست بخات، بەخەمباری بەرەو ماڵ گەڕایەوە، لە ڕێگەدا کاتێك سەیری ئەملاو لای خۆی دەکرد، بینی ئەوە سـەردارە، جلوبەرگی فیتەری لەبەردایەو لە دوکانی وەسـتا حەسـانی فیتەر کار دەکات، بەپەلە ڕۆیشت بۆ دوکانەکەی، داوای مۆڵەتی لە وەسـتا حەسـان کرد، کە ڕێگەی بدات کەمێك قسە لەگەڵ سەرداردا بکات.

خالید: سەردار چی ڕووی داوە؟ بۆچی تۆ لێرەیت؟ بۆچی نەهاتبوویت بۆ قوتابخانە؟

سەردار: لە ڕاستیدا قوتابخانە خەرجیی زۆرەو پێویستی بە زۆر کەلوپەل هەبوو؛ تا بیکڕمو بتوانم بخوێنم، تۆش باش دەزانیت لەو کاتەی باوکم مالآوایی لە ژیان کرد، ئێمە خاوەنی هیچ سەروەتو سامانێك نەبووین، کەسی کاسبکاریشمان نییە، ماڵیش پێویستی بە پارەو خەرجی هەیە، منیش ئەم کارەم لێرە دۆزییەوە لای وەستا حەسان کار دەکەم، تا بتوانم خەرجیو پێداویستییەکانی ماڵ بۆ دایکمو خوشکە بچکۆلەکەم دابین بکەم، پاشان ئەگەر توانیم لە ئایندەدا درێژە بە خوێندن دەدەم، بەلآم لە ئێستادا تاکە ڕێگەچارە ئەوەیە کە من دەبێت کار بکەم، نەك بخوێنم.

دوای ئەم گفتوگۆیە، خالید بە خەمباری مالآوایی لە سەردار کردو بەرەو ماڵ گەڕایەوە، باوکی پرسیاری لە خالید کردو گوتی: کوڕم ڕۆیشتیت بۆ لای سەردار؟ زانیت هۆکاری نەهاتنەوەی بۆ قوتابخانە چی بووە؟

خالیدیش ڕووداوەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە، پاشان گوتی: بابەگیان ئایا تۆ ڕێگەچارەیەك شك نابەیت؛ تا سەردار واز لە قوتابخانە نەهێنێتو درێژە بە خوێندنەکەی بدات؟ بەڕاستی ئەو

له قوتابخانه زۆر زیرەکه، دڵنیام به پشتیوانیی خودا، پاشەڕۆژێکی ڕوونو گەشی دەبێتو دەتوانێت پلەی باش بەدەست بهێنێت..

باوکی خالید گوتی: بۆچی نا کورم، چارەسەری دەکەین، بەڵام لەبەرئەوەی خۆت سەردار باش دەناسیت، خاوەنی دمروونێکی بەرزو کەسێکی به ئارامو به قەناعەتە، هەرگیز یارمەتی له ئێمه قەبوڵ ناکات، ئەگەر ئێستا پێی بڵێم ئەوەی لای وەستا حەسان دەستت دەکەوێت، من پێت دەبەخشم، بەڵام تۆ بڕۆ بخوێنەو له قوتابخانه دامەبڕێ، هەرگیز لێمان قەبوڵ ناکاتو به قسەشمان ناکات، بەڵام من دەتوانم کارێکی بۆ بدۆزمەوە که ڕێگر نەبێت له خوێندنەکەی.

خالید: چۆنو چ کارێك؟

باوکی خالید: بڕۆ بۆ لای سەردارو پێی بڵێ، با هەموو ڕۆژێك بەیانیان بڕوات بۆ قوتابخانه، دوا نیوەڕوان بێت بۆ دوکانەکەی من کار بکات، به شەویشدا سەرقاڵی سەعیکردنو پێداچوونەوەی وانەکانی بێت.

خالید بەم چارەسەره زۆر خۆشحاڵ بوو، زۆر سوپاسی باوکی کرد، داوای مۆڵەتی کرد تا بڕوات ئەم هەواڵه خۆشه به سەردار بگەیەنێت، کاتێك گەیشته لای سەردارو ئەم هەواڵەی پێ ڕاگەیاند هەردووکیان زۆر خۆشحاڵ بوون، باوەشیان کرد

بە یەکداو سەردار زۆر سوپاسی خالیدو باوکی کرد.. خالیدیش گوتی: هاوڕێی ئەزیزم هەرگیز بە تەنها جێت ناهێڵم!

ئیدی لەو ڕۆژە بەدواوە، سەردار بەیانیان دەڕۆیشتە قوتابخانەو دوانیوەڕوان دەڕۆیشتە دوکانی باوکی خالیدو شەوانیش خەریکی سەعیو پێداچوونەوەی وانەکانی بوو.

پوختە:

✍ هاوڕێی ڕاستەقینە هەرگیز بە تەنیا جێت ناهێڵێت، لە هەموو باروودۆخێکدا، چ لە خۆشیو چ لە ناخۆشیدا، ناهێڵێت تەنیا بیت.

✍ هەر کارێك بەلای تۆوە قورسو سەخت بوو، بە هاوکاری دایكو باوکت دەتوانیت ڕێگە چارەیەکی بۆ بدۆزیتەوە، هەروەکو خالید بە ڕاوێژی باوکی چارەسەری بۆ سەرداری هاوڕێی دۆزییەوە.

✍ ئەگەر ماسییەکت دا بە هاوڕێکەت، ئەوا ژەمێك خۆراکت داوەتێ، بەڵام ئەگەر فێری ماسی گرتنت کرد، ئەوا پیشەیەکی فێردەکەیتو خواردنی هەموو تەمەنی پێدەبەخشیت.. تۆش دەتوانیت لەبری ئەوەی بڕێك پارەی کەم بدەیت بە هاوڕێکەت، کارێکی بۆ بدۆزەرەوە.

## ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێ وەرگیراوە


١- احكي لي يا امي حكاية.

٢- حكايات قبل النوم.

3- http://haybinyakzhan.blogspot.com

4- /http://www.stories_ar.com/2016/02

stories_children_short_stories_atfal_Image.html